یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا

41

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی چوارەم تشرینی یەکەمی - ٢٠١١

ئافرەتی سەرکەوتوو
کێیەو چۆنە؟

پەیامێکی بێناونیشان!

نووریێکی نوێ

لەخزمەتی (نالی)دا

چۆن
بڕوا بەخۆبوون
بنیاد دەنێیت؟

ڕازی نرخ

ژیان
بەپلان

هاوڕێییەکی دەگمەن!

دەتەوێت شێربیت، یا ڕێوی؟!

Www.bryarmagazine.com





The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan




مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی چوارەم - ژمارە 41 - تشرینی یەکەمی 2011





























**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی سێیەم
نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢
هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠
E-mail: bryar@bryarmagazine.com



دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك
٣٢٠٤٠٩٦ - ٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار



ەری ڕاستەقینە بۆ سەرکردە،
مارەی ئەو کەسانە نییە کە
خزمەتی دەکەن،
کو ژمارەی ئەو کەسانەیە کە
خزمەتییان دەکات!

یەکەم دڵۆپ

سەرنووسەر

# شوێنەواری پێشینان



به بینینی شوێنەواری ئەو سەرکردانە سەرسام دەبم، کە لە دوای خۆیان لە بری قسەی زۆر، کرداری زۆریان بەجێهێشتووە!

دوای مردنی خۆیان دەیان پەرتووکیان لە قسەی بریقەدارو وتاری حەماسیو دروشمی ڕەونەقداری بێ کاکڵەیان بەجێنەهێشتووە، تا نەوەکانی دوای خۆیان، تەنها سەری تەسدیق ڕاوەشێننو بێئەوەی هیچ شتێك لە پاشماوەی باوو باپیرانی خۆیان ببینن!

هەڵبەت کاتێك بۆماوەی میللەتێك زێتری خۆی لە قسەی زلدا ببینێتەوە، نەوەکانی داهاتوو هەست بە گەورەیی پێشینانی خۆیان ناکەنو خۆشیان بە نەوەی گەورەپیاوانو کەڵەپیاوانی مێژوو نازانن!

ئەو کاتەش وەکو نووسەرێك دەڵێت: گەورەترین بەلا بۆ نەوەکان ئەوەیە، کاتێك تەماشای دەوروبەری خۆیان دەکەن، تەنها پیاوانی خوار پلە یەك دەبینن!

لەم ماوەیەدا سەردانی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانیم کرد، (ئەستانبوڵ) هەڵبەت لێرەدا مەبەستم هەڵسەنگاندنی دەوڵەتی عوسمانی نییە، کە قسەگەلێکی زۆر هەڵدەگرێو ئێمەی کوردیش پاڵەوانی ئەو مەیدانەین، زۆرجار هێندەی ڕووی نەرێنی شتەکان دەبینین، هێندە بە ئەرێنی نایانبینین!

بەڵکو دەمەوێت سەرنجتان بۆ لای ئەوە ڕابکێشم کە پێشینانی ئەوان چییان بۆ دوای خۆیان بەجێهێشتووە، نەك چییان بۆ غەیری خۆیان، یان چییان بۆ کورد کردووە؟!

ئەو وڵاتە هەر هەنگاوێك کە بەسەر خاکەکەیدا دەگوزەرێنی، ژیارو پێشکەوتنی گەورەت وەبیر دەخاتەوەو دەکرێت بڵێین: تێکڕای ئەو شارەی من بینیم، مۆزەخانەیە!

ئەمە وێڕای ئەوەی کە خزمەتکردنی وڵاتو پاکوخاوێنیو ڕێکوپێکیو چەندین ئەتیکێتی ژیان، کە بێگومان کاری چەند ڕۆژێك نییەو پەروەردەو بۆماوەی چەندین سەدەیە.

هەموو ئەو کارانەش تەنها بە ڕەشکردنەوەی ڕووپەڕی کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامە فەراهەم نابن، بەڵکو دەبێت پەروەردەو ڕاهێنانو پیادەکردنێکی ئەکتیڤ بن، لە لایەن هەموو تاکێکی کۆمەڵگاوە.

ئەوان دەتوانن زوو وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە کەچی کراوە لە ڕابردوودا ئێستا چی دەکرێتو چی لەبەرنامەدایە بۆ داهاتوو!

ئەوان ڕازیین بەو کەسەی کە خزمەتی وڵاتەکەیان دەکاتو ڕەوڕەوەی وڵاتەکەیان بەرەوپێش دەبات، با لە بیروبۆچوونیشدا لەگەڵیان جیاواز بێت، چونکە بەرژەوەندی وڵاتەکەیان لە سەرووی هەمووشتێکەوە داناوە!

بەڵام بەداخەوە ئێمە تا ئێستا لەسەر گەورەترین بنەمای نەتەوەیی کۆك نین، کە پاراستنی بەرژەوەندی گشتی گەلو نەتەوەیە، بەڵکو بەرژەوەندی حیزبی و زۆرجار تاکەکەسیش لەسەروو هەموو ئیعتبارێکەوەیە.

دەکرێت لە بری پیلانو ململانێو دەستشکاندنو سەرشکاندن، بە یەك دەست هەوڵی ئاوەدانکردنەوەو سارێژکردنی برینەکان بدەین!

لە بری ئەوەی وڵاتی خۆمان فەرامۆش بکەینو بۆ پشوو سەیران ڕووبکەینە وڵاتان، وڵاتی خۆمان بکەینە بەهەشتی سەرزەویو لە بری پوشو پەڵاشو خۆڵو خاشاك، گوڵوگوڵزار بڕوێنین!

بەڵام کێ بەم کارە هەڵسێو چۆن؟!

کە تائێستا کەس خۆی لە قەرەی ئەم پرسیارانە نادات، چونکە ئێمە تەنها دەمانەوێت، ئەم وڵاتە بدۆشین، بێئەوەی هیچی پێشکەش بکەین!

خۆشەویستان، زەمەن ناوەستێت، مێژوو خامەکەی دانانێت، نەوەکانی دوای خۆمان نامانبوورن!

من تا ئێستا کتێبێکم لە نووسینی سوڵتانێکی عوسمانی نەبینیوە، بەڵام بینیم دوای خۆیان، پاشماوەی دەسەڵاتەکەیان، مایەی شانازی نەوەکانی دوای خۆیانە!

با هەموو لایەکیش بزانن، کە ڕۆژێك هەر دێت، ماڵاوایی لە ژیان بکەین، بەڵام جیاوازن ئەو کەسانەی بە نەمری لە دڵی نەتەوەکەیاندا دەژینو ئەوانەی کە هەر لە ژیانی خۆیاندا زیندە بەچاڵ دەکرێنو دوای نەمانی خۆیان هیچ شوێنەوارێك نابێت، کە یادیان زیندوو ڕابگرێت!

ئەمڕۆش هیچ بەهانەیەکمان نەماوە، ئەمە وڵاتی خۆمانەو دەی با کوردپەروەرانو وڵاتپەروەران، بێنە پێشەوەو بە یەك دەنگ بڵێین: کوردستانە، جێی شێرانە، دەبێت سەرکەوێ!

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەوەی درك بڕوێنێت، ترێ ناچنێتەوە!

پەندێکی عەرەبی

بێهیوایی، خۆکوژیی دڵە!

ریختر

بۆچی خۆمان بخەینە دەریاوە،
پێش ئەوەی پاپۆڕەکە نقوم ببێت!

پەندێکی چینی

ئەو گەلەی وەفای نییە،
نازانێت پێشکەوتن چییە!

پەندێکی تایلاندی

ئەوەی زمانی شیرینە،
هەمیشە هاوڕێی زۆرە!

ئیبنولموقەففەع

ئەوەی لە گورگ بترسێت،
نابێت بچێت بۆ دارستان!

پەندێکی ڕووسی





# دەتەوێت شێربیت، یا ڕێوی؟!

کابرایەکی بازرگان کوڕێکی خۆی بۆ بازرگانی ناردە شارێکی دوور، لە گەشتەکەیدا کوڕی کابرای بازرگان، کاتێك بە ڕێگەدا دەڕۆیشت، چاوی بە ڕێوییەك کەوت، کە لە برسا دەینالآند، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەم هەژارە دەبێت لە کوێوە شتێکی دەستبکەوێت، تا بیخوات؟ چۆن دەتوانێت شتێك پەیدا بکات، تا لە برسا نەمرێت؟

لەو کاتەدا کە ئەو بیری لە حاڵی ڕێوییەکە دەکردەوە، لە ناکاو شێرێك پەیدا بوو، نێچیرێکی بە کەڵبەکانی هەڵگرتبوو، کوڕە لاوەکەش لە ترسا لە پەنایەك خۆی شاردەوە، بەڵام بە نهێنی چاودێری شێرو ڕێوییەکەی دەکرد، تا بزانێت چی ڕوودەدات، تەماشای کرد شێرەکە دەستی بە خواردنی نێچیرەکەی خۆی کرد، دوای ئەوەی تێری لێخوارد، بەجێیهێشت، بەڵام شتێکی وەهای پێوە بەجێنەهێشتبوو، کە سوودێکی وەهای لێوەربگیرێت!

کاتێك شێرەکە نێچیرەکەی بەجێهێشتوو دوورکەوتەوە، ڕێوییەکە بە سکەخشکێ خۆی گەیاندە بەرماوەی شێرەکەو دەستی بە خواردنی کردو هەرچۆنێك بێت، بەشی خۆی لێپچڕی‌و لە برسێتی ڕزگاری بوو!

کوڕی کابرای بازرگان بڕیاری دا، ڕێوییەکە بکاتە پێشەنگی خۆی‌و چاوی لێ بکات!

هەر لەبەرئەوە گەڕایەوە بۆ لای باوکی‌و وازی لە گەشتەکەی هێنا، ئەو دیمەنەشی بۆ باوکی گێڕایەوە، کە چۆن ڕێوییەکە توانی لە پاشماوەی شێرەکە خواردنی خۆی دەستبخات، بەبێ هیچ ماندووبوونێك، کوڕەکە ئەو کارەی بە شتێکی ئاسان‌و خۆش دەهاتە بەرچاو، کە وادەکات مرۆڤ خۆی ماندوو نەکات و بەبێ ماندووبوون خواردنی خۆی بە دەست بێنێت، بەم شێوەیە دەژی‌و نامرێت!

بەڵام باوکی وەڵامی دایەوەو گوتی: کوڕی شیرینم: تۆ هەڵەیت، من ئاواتەخوازم تۆ شێر بیت‌و ڕێوییەکان لە پاشماوەی تۆ بخۆن، نەك ڕێوی بیت‌و لە پاشماوەی شێرەکان بخۆیت!

**لەم چیرۆکەوە فێردەبین:**

١- مرۆڤ بە هیممەتی بەرزەوە، لە بوونەوەردا جێ پێی خۆی دەکاتەوەو بوونی خۆی دەسەلمێنێت!

٢- هەندێك وەکو ڕێوییەکە بیر دەکەنەوە، هەمیشە چاویان لە پاشماوەی کەسانی ترەو خۆیان بە شایانی ئەوە نازانن کە ڕۆژێك لە ڕۆژان شێر بن.

٣- خەمی زۆرێك لە خوێندکارانی زانکۆو پەیمانگاکان ئەوەیە، کە دوای دەرچوونیان کەس دایاننامەزرێنێت، یاخود هیچ کارێك نابێت بیکەن! ئەی بۆچی هەمیشە چاوەڕوانی دەستی کەسانی تربین، تا دامان مەزرێنن، یاخود کارمان پێ بکەن؟ بۆ خۆمان بیر لەوە نەکەینەوە کە ئێمە بتوانین کەسانی تر دابمەزرێنین‌و کاریان بۆ پەیدا بکەین؟!

٤- با هەوڵبدەین خاوەنی پڕۆژەی خۆمان بین‌و خۆمان بە بەشێك لە پڕۆژەی کەسانی تر نەزانین، بێ بیرکردنەوە دانەنیشتن دوای (١٦) ساڵ خوێندن، تەنها چارەنووسمان لە دامەزراندندا نەبینینەوە!

٥- پیرەمێردی شاعیر گوزارش لە هیممەتی بەرزی خۆی دەکات‌و دەڵێت:

لە سایەی عیززەتی نەفسم
مل کەچ ناکەم بۆ هیچ کەسێ
سەرم بەرزە کە نایەڵێت،
دەمم بەرم بۆ هیچ دەسێ!

چەند شانازییە بۆ مرۆڤ کە ئاوا بژی؟!

٦- هیممەتی مرۆڤە خاوەن ئامانج‌و هیممەت بەرزەکان ململانێ لەگەڵ لوتکەی چیاکاندا دەکات‌و هیچ بەربەستێك ناتوانێت بەرامبەری بووەستێت، بە هیممەتی ئەوان‌و لەسەرشانی ئەوان، پڕۆژەگەورەکان بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی، دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە، تاوەرە بەرزەکان، پردە هەڵواسراوەکان، کەشتی‌و فڕۆکە گەورەکان، ...هتد، بێ هیممەتی ئەوان، هەرگیز دروست نەدەبوو، کەواتە بوونی مرۆڤ، واتە بوونی هیممەت‌و ئاواتی بەرز.




## ئەم کتێبە بەرهەمێکی بە نرخی دەستی بە ئەمەکو دڵسۆزی گۆڤاری بڕیارە

بۆ یەکەم جار بە زمانی شیرینی کوردی، کتێبێکی قەشەنگ باس لە چەمکی بەڕێوەبردنو کارگێڕی دەکات و لە گرنگیو بوارەکانیو گرنگترین هەنگاوەکانی کارگێڕی دەکۆڵێتەوە..

لەم کتێبەدا بە گرنگترین قوتابخانە کارگێڕییەکان ئاشنا دەبیتو بە پلیکانەی بەڕێوەبردندا لە پلاندانانەوە بەرەو ڕێکخستنو ئاڕاستەکردنو چاودێری، پاشان جێبەجێکردنو بازاڕسازی، هەنگاو دەنێیت..

وەرگێڕانی ئەم کتێبە بە بڕوای من، یەکەم کتێبی زانستیو مەنهەجییە لە بواری بەڕێوەبردندا، بەم کارەشی کاک وەهاب لە بوارێکی زۆر گرنگدا گەورەترین خزمەتی پێشکەشی بە نەتەوەکەی کردو زمانی کوردیشی دەوڵەمەندتر کرد.

لە نزیکیشەوە ئاگاداری کاک وەهاب بووم کە زۆر ماندوو بوو، هەوڵی دا بەشێوەیەکی موحتەریفانە وەرگێڕانەکە بە زمانێکی زانستی وەربگێڕێت، هەڵبەت وەرگێڕانی دەقە زانستیو زاراوەییەکان کارێکی ساناو ئاسان نین.

بەڵام بۆ مرۆڤی خاوەن ئیرادەو بێوچان هیچ کارێك ئەستەم نییە!
ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی گرنگە، پێویستە لە کتێبخانەی مامۆستایانو قوتابیانی کۆلێژەکانی بەڕێوەبردنو کارگێڕیدا هەبێت.
هەر سەرکەوتوو بن.

عادل شێخانی
سەرنووسەری گۆڤاری بڕیار

# ئێستا لە بازاڕدایە

# چۆن دەبیتە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو؟

هیوا ئارام

**کارگێڕی چییە؟ بەڕێوەبەر کێیە؟**
بیهێنەرە پێش چاوی خۆت، گەر لە ناکاو ئەم دوو پرسیارەت ئاراستەکرا، چۆن وەڵام دەدەیتەوە؟ دەڵێیت: نازانم، یان دەڵێیت: من تەنها فەرمانبەرێکم، چ پێویستم بە زانینو قووڵبوونەوە هەیە لە کاروباری بەڕێوەبەرو بەڕێوەبردندا!

بێگومان ئەمە وەڵامێکی هەڵەیە، گەر خۆشت نازانی وەڵام بدەیتەوە، ئەوا پێویستە لە بەڕێوەبەرەکەت بپرسی، تا وەڵامێکی گونجاوت دەست بکەوێت..

خوێنەری بەڕێز.. گەر لەو بڕوایەدابیت تۆ کارمەندێکی ئاساییتو پێویست ناکات بزانیت کارگێڕیو بەڕێوەبردن چییە، لە ڕاستیدا ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە، لە واقیعدا ئێمە هەموومان بەڕێوەبەرین، ڕەنگە هەمووان شوێنەکەمان، یان ئەرکو وەزیفەکەمان، سەپاندبی بە سەرماندا کە هەندێك کاروبار بەڕێوەبەرین، بەڵام با کەمێك هەڵوێستە بکەین، تا بزانین چۆن دەتوانین ببینە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو؟

زۆرجار بەڕێوەبەری دامەزراوەیەك دەبینین، لە ژمێریاریو کارگێڕیو.. هتد، خاوەنی بڕوانامەی ماجستەرو دکتورا نییە، بەڵکو هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی لە کارەکەیدا تەنها ئەوەیە کە وەکو پلەی بەڕێوەبەر بە لێهاتووییو کۆڵنەدانو ئارامگرتنەوە کاردەکات!

پسپۆران دەڵێن: سەرکەوتنو بەرەوپێشچوونی هەر داموو دەزگاو دامەزراوەیەك، دەگەڕێتەوە بۆ لێهاتوویی بەڕێوەبەرەکەی، بە پێچەوانەشەوە شکستو دواکەوتوویی هەر داموو دەزگاو دامەزراوەیەك، دووبارە لە ئەستۆی کەمتوانایی بەڕێوەبەردایە..

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو دەتوانێت کارێك بکات لە دامەزراوەکەیدا کارمەندەکانی بە ڕۆحی هاریکاریو یەکڕیزیو گروپ کاربکەن، شارەزایان لەو باوەڕەدان هەر کارمەندێك ئەگەرچی پلەو ئاستی وەزیفیشی لە ئاستێکی نزمدا بێت، بەڵام دەتوانێت بە هەوڵو ماندووبوونو تێکۆشان، ببێتە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو..

**ئامانجەکەت دیاری بکە:**
(خلیل شقفە) کە چالاکوانێکی بواری ڕاهێنانو کارگێڕییە، جەخت دەکاتەوە کە سەرکردەو بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، دەبێت خاوەنی چەند بنەمایەکی سەرەکی بێت، گرنگترینیان، دیاریکردنی ئامانج بەشێوەیەکی وردەکارانە، خاوەنی توانایەکی باش بۆ پەرەپێدانو داهێنان، هاوکات متمانە بەخۆبوونو هەستکردن بە بەرپرسیارێتیو جەربەزەو چاونەترس بێت، لەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە پەیامەکەی بە ڕوونیو ئاشکرایی بنێرێت بۆ هەموو ئاستە جیاجیاکان.

ئەم چالاکوانە ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات ئەگەرچی گیروگرفتو کۆسپو تەگەرەو تەنگو چەڵەمەکان، مرۆڤ تووشی بێهیوایی دەکەن، بەڵام لە هەمان کاتدا بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو لێهاتوو دروست دەکەن، بۆ ئەو کەسەی ئارامگرو کۆڵنەدەرو بەردەوامە.. هاوکات پرسو ڕاوێژکردن بە کەسانی شارەزاو پسپۆڕ لە سیفاتی بەڕێوەبەری سەرکەوتووە..

شارەزایانی بواری کارگێڕی لەو بڕوایەدان، کە بنەمای کارگێڕییەکی سەرکەوتوو، بەهرەو زیرەکیو لێهاتووییو هونەرو هەوڵدانە، لەسەر ئەم بنەمایە، مامۆستا مەئمون بسیسو (یەکەم ڕاوێژکاری بەڕێوەبردنی پرۆژەکانی گەشەپێدان، لە پەیمانگای بەرەودانی کۆمەڵگە) دەڵێت: گرنگترین سیفاتی سەرۆکو بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، (پێوانەکردنی بەها بەرزەکانە بە ئاکارو ڕەوشتی کەسێتی بەڕێوەبەرو سەرکردە، واتە لە هەموو شتێك گرنگتر ئەوەیە کە بەڕێوەبەر خاوەنی کەسایەتییەکی جوانو ئاکارو ڕەوشتی بەرز بێت، ڕۆچوون لە کاروبارە گرنگەکان، توانای دیاریکردنی ئامانجەکان، ڕێکخستنو دیاریکردنی کاری لە پێشینەو بە دەستهێنانی هەبێت).

**جۆرەکانی بەڕێوەبەر:**
بە پێی بیردۆزەکەی بسیسۆ، سێ جۆر بەڕێوەبەر هەیە:

**١- بەڕێوەبەری زۆردارو دیکتاتۆر:**
دەسەڵاتو بڕیاردان بۆ خۆی قۆرخ دەکات، وادەزانێت جگە لە خۆی کەس ناتوانێت ئەو دامەزراوەیە بەڕێوەبەرێت، وا هەستدەکات کە هەموو بەرەوپێشچوونێکی دامەزراوەکەی ئازایەتیو لێهاتوویی خۆیەتی، دەستکەوت بە موڵکی خۆی دەزانێتو شکستیش دەداتە پاڵ کارمەندەکانی. چارەنووسی ئەمجۆرە بەڕێوەبەرە سەرنەکەوتنو شکستە، ئەمڕۆ بێت، یان سبەی.

**٢- بەڕێوەبەری دیموکراسی:** ئەمجۆرە بەڕێوەبەرە جێگرو کارمەندانی بەشدار پێدەکات، لە کارکردنو بڕیاردانو داهێنانو بەرەو پێشبردنی دامەزراوەکەیو خێرایی بەدیهێنانی ئامانجەکانی، تەنها خۆی بە خاوەنی پێشکەوتنەکان نازانێت، بەڵکو دڵنیایە بەبێ هاوکاری هاوکارەکانی ناتوانێت، دامەزراوەکەی بەرەوپێش ببات.. بێگومان ئاکامی ئەمجۆرە بەڕێوەبەرە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە گەشەسەندنو سەرکەوتنو بەرەوپێشچووندایە.

**٣- بەڕێوەبەری ئاژاوەگێر:** ئەم بەڕێوەبەرە بە شێوەیەکی ڕەها ڕێگە بە کارمەندانی دەدات ئازادانە هەر جۆرە هەڵسوکەوتێك پێیان خۆشە ئەنجامی بدەن، بەبێ ڕەچاوکردنی یاساو ڕێکخستنی کارەکان، ئەمەش بە دیهاتنی ئامانجەکانی کەم دەکاتەوەو ئەگەری شکست زیاد دەکات.



# گەندەڵی كارگێڕی

ئا: خەندە ڕەمەزان - زكرا ڕەمزی



# دوو ڕوویی لە كارگێڕیدا

## بەشی چوارەم

**بەندی دووەم: دوو ڕوویی لە كارە كارگێڕییەكاندا:**

دووڕوویی لە كارە كارگێڕییەكاندا یەكێكە لەو نەخۆشییە ترسناكانەی كەوا داموو دەزگا كارگێڕییەكان دوو چاری دەبنو لە ئەنجامدا دەبێتە مایەی (ئیفلیجی دۆستەكان)و(كۆمەڵی بەڕێوەبەران)و (كۆمەڵی سوودبینەكان)و چالاكییەكانی.

فەرمانگەو دەزگاكانی بەڕێوەبردن لەكەدار دەكات، ناوەڕۆكی دیاردەكە گوزارشتە لە هەڵسوكەوتو خۆنیشاندانی كۆمەڵێك لە فەرمانبەرانی دەروون نزم لەبەردەم بەرپرسەكان، كەوا دڵسۆزو خەمخۆری كاركردن دەكەنو تەنها مەبەستیان بەرزكردنەوەی ئاستی ئەم كارانەیە، ئەگەر بەرپرسەكە بڕیارێكی وەرگرت سەبارەت بە ژیانی ڕێكخستنەوە، یاخود پەیڕەوی سیاسەتێكی نوێ بكاتو ناكۆك بێت لەگەڵ سیاسەتی لێپرسراوەكەی پێشوودا، ئەوا ئەو فەرمانبەرانە بەشانو شەوكەتی ئەم بڕیارەدا هەڵدەڵێن، بە بڕیارێكی ژیرو دروست باسی دەكەنو ئەم سیاسەتە پەیڕەو دەكرێت لەم ڕێكخراوەكەدا نیە.

ئەگەر فەرمانگەكە دووچاری شپرزەییو نالەباری بووەوە، بە هۆی پیادەكردنی سیاسەتەكانو وەرگرتنی بڕیارە نەگونجاوەكانی بەڕێوەبەر، ئەوا ئەم دووڕووانە دڵنیای دەكەنەوەو پاساوی ئەوەی بۆ دەهێننەوە ئەوەی ڕوویداوە بەهەڵەو نا دڵسۆزی فەرمانبەرە ژێر دەستەكان بووە، یان هۆكارەكانی ماددین. بەم شێوەیە دیاردەی دووڕوویی بەرچاوی بەرپرسەكان تەماوی دەكات، بەرژەوەندی ڕێكخستنو ئایندەی نابینێت، واڕوویداوە دووڕوویی كارگێڕی ببێتە پرد بۆ پەڕینەوەوگەیشتن بە ناوەندە سەركردایەتییەكان، لەوانەی ڕیزبەندی فەرمانبەرە ناوەندەكانن لە داموو دەزگاكانی بەڕێوەبردن، داودەستەی بەڕێوەبردنی پاداشت خۆشحاڵەو ڕازییە، شێوازی دووڕوویییە ئەوان پەسەندتری دەكەنو لە سەر ڕووی تواناو توانستی دادەنێن، بۆ گەیشتن بە پلەو پایە بەرزەكان بە شێوەیەكی گشتیو پایەی سەركردایەتی بە شێوەیەكی تایبەت.

ئەو چەپڵە لێدەرانەو زووڕنا بێژانەی كەوا بەرز بوونەتەوە تەنها شارەزایی، یان پسپۆڕیان هەیە، چۆن پاشكۆی دەسەڵاتە باڵاكانی((دەزگا كارگێڕییەكان نییە؟ پابەندن بە ڕێسای بۆ گەیشتنە ئامانج هەموو شێوازەكان حەڵاڵن). دەكرێت دووڕوویی فەرمانبەرە ژێر دەستەكان هۆكارەكەی بگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی ژینگەیی، یان ڕەفتارەوە بێت، بۆ دەستكەوتێكی ماددی بێت، یاخود دەسكەوتێكی زەینی بێت، وەك ئەوەی لەبەردەم هاوڕێكانی خۆی وانیشان بدات كەوا (دۆستی بەڕێوەبەرە)، یان (پێڕپەتی)و بەشداری لەگەڵدا دەكات لە وەرگرتنی بڕیارەكان، خراپترین شێوازی ئەم دیاردەیە هەوڵ و تەقەلای دووڕووەكانن بۆ شێواندنی وێنەی هاوڕێ دڵسۆزەكانی لە كاركردندا لەبەردەم بەڕێوەبەر، یان بۆئەوەی بە چاوێكی سووك سەیریان بكاتو متمانەیان پێنەكات.

دووڕوویی یەكێكە لەم تیۆرانەی كەوا گەندەڵی دەخرێتە پاڵییەوە، چونكە لە دەوڵەتێكدا ئەگەر كەرتی گشتی گەورەبوو ئەوا ئاستێكی بەرزی گەندەڵی تیایدا بەدی دەكرێت، بەڵام حاڵەتی سەنغافوراو فلەنداو سوید ئەم تیۆرە ڕەت دەكەنەوە، لەم وڵاتانەدا گەندەڵی لە ئاستێكی زۆر نزمدایە، هەرچەندە كەرتی گشتییان گەورەیە.

بێگومان دیاردەی دووڕوویی كارگێڕی دەردێكی كوشندەیە ڕێكخراوەكە لە ناو دەبات، بە لایەنی كەمەوە لەشیرازەی خۆی دەیترازێنێو شپرزەی دەكات، بۆیە پێویستە بەڕێوەبەر بیرتیژو فراوان بێتو باخەڵ فووڵ بێت لە مامەڵە كردنیدا لەگەڵ فەرمانبەراندا، تەنها ئەو ڕاوبۆچوونانەیان وەربگرێت كەوا دوای لێكۆڵینەوەو خوێندنەوەیان بە وردەكاری تەواو شیكردنەوەیان لە بەرژەوەندی گشتی كاركردندان، هەروەها پێویستە دڵسۆزی ڕاستگۆیی لە كاركردندا دروشمی بەردەوامی فەرمانبەران بێت، ئەوەی ئەنجامی دەدەن لە پێناو بەرژەوەندی ڕێكخراوەكەیان بێت.

پێویستە دەستەی باڵای ڕێكخراو دووربینو چاو تیژبن، بۆئەوەی دوو ڕووەكان دەستنیشان بكەن و جیایان بكەنەوە لەگەڵ دڵسۆزەكانو ڕاستگۆیەكان، پێویستە ئاگادار بین یەكێك لە خەسڵەتەكانی دوو ڕوو (درۆزنییە) ئەو درۆ لەگەڵ خۆیدا دەكات، كاتێك دووڕوویی دەكات، بەر پرسەكەی فریو دەدات، كەواتە چۆن متمانە بەم كەسانە دەكرێت، خوودی خۆیان بێ

متمانەن درۆو دەلەسەو دووڕوویی دەکەنە ئامرازێك بۆ بەرزبوونەوەی پلەو پایەیان، ڕاستی فەرمووە پەیامبەری مرۆڤایەتی محەممەد (دروودی خوای لێ بێت): (نیشانەی دووڕووەکان سێ شتن، ئەگەر قسەیان کرد درۆ دەکەن، ئەگەر بەڵێنیاندا پاشگەز دەبنەوە، ئەگەر شتێکیان پێ سپێردرا، ناپاکی لێدەکەن)، بۆیە دەبێت بەرپرسە کارگێڕییەکان ڕۆڵی دووڕووەکان پەراوێز بکەنو سنووریان بۆدابنێن، لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییانەی ئاماژەمان پێکردووە، پێویستیمان بە زانستێك هەیە کەوا ئەو ڕێساو بنەمایانە دەستنیشان بکات، بۆئەوەی ڕێنیشاندەر بن بۆ پوختبوونو دروستی کارە کارگێڕییەکان، ئەرکەکانیان زانستانە ئەنجام بدەن، پێویستە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان کۆلێژو پەیمانگا کارگێڕییەکان زۆرتر دابمەزرێنێت، هەروەها ڕێنماییو ڕێساو یاساکان ڕوونبکرێنەوەو مافو پابەندبوون دیاری بکەن، وەرێو شوێنی جێبەجێکردنەکانو کارگێڕی ڕاستو دروستبن، شیکردنەوەی جیا جیا نەیەتە ئاراوە، هاوکات دانانی پێوەرەکان بۆئەوەی دەستەکانی حکومی بتوانن بەوردی پەیڕەوی بکەن. دەسەڵاتدارانی وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان بەر لە گەلەکانیان داوا لێکراون بەراپەراندنی ئەرکەکانیان بۆ دەربازبوون لە بازنەی دواکەوتوویی گەیشتن بەکاروانی دەوڵەتە پێشکەوتووەکان لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا.

**کێشەو لاوازی سەرکردەکان:**

لێرەدا نیشانەکانی لاوازی دەسەڵاتو کەسایەتی سەرکردە باس دەکەین، لەگەڵ هۆکارو چارەسەرەکانی لاوازی سەرکردایەتی، سەرەتا وەکو بەرچاو ڕوونییەك پێناسەی لاوازی سەرکردایەتی دەخەینە بەرباس.

**لاوازی:** بریتییە لە لاوازی کاریگەری بەرنامەو سیاسەتەکانی سەرکردە لەسەر دەروونو هەڵسوکەوتی تاکەکان بۆ گەیشتن بە ئامانج .

* نیشانەکانی لاوازی سەرکردەکان:

- نەبوونی ڕێکخستنێکی تەواو لە ناو کۆمەڵگەدا.
- پارێزگاری نەکردنو پشتگیری نەکردنی هاوکارەکانی.
- لاوازی لە هەنگاونان بۆگەیشتن بە ئامانجو کارو چالاکییەکانی ڕێکخراو.
- بوونی هەندێ خەسڵەتی نەرێنی لە نێو هەندێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵگەدا.
- گوێ نەگرتن بۆڕای بەرامبەر.

*** هۆکارەکانی لاوازی سەرکردە:**

- دەگرتن لەیەك چوارچێوەی سەرکردایەتی کردندا.
- باوەڕنەبوون بە هەندێك ئامانج.
- خۆشەویستی کارەکەو شارەزا نەبوون لێی.
- پەلەکردن لە دروستکردنی سەرکردەو پێدانی پۆستی سەرکردایەتیو پێش ئامادەکردنی بە باشی.
- زۆربوونی هەڵەکانو چارەسەرکردنیان.

**بەندی سێیەم:**

**واتاو ناوەڕۆکو گرنگی گەندەڵی:**

لەم ساڵانەی دواییدا، چەند دیاردەیەك کە تایبەتە بە هەڵسوکەوتی نابەجێی تاکەکەس دەرکەوتو سەری هەڵدا، ئەمەش دەردەکەوێت لە ناپاکی کەسەکان لە (هەڵسوکەوت - کارکردن - لایەنی سەرمایەداری)، ئەمەش کاری کردووەتە سەرئابووری عێراق، چونکە ئەم دیاردانە وەکو مشەخۆر چۆتە نێوداموو دەزگاکانی دەوڵەتو لەناوبردنی هەموو تواناکانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دیاردانە، جگە لە بەربەرەکێ جیهانگەراییو ئاکامی شەڕو قەیران لەسەر عێراقو هەموو گۆڕانکارییە سیاسییە نێو دەوڵەتییەکان، ئەمانە هەمووی بووەتە هۆی پرسیارکردن لە هۆیەکانی ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە، هەوڵدان بۆ دانانی چارەسەری سەرکەوتوو.

**بەشی دووەم: بەندی یەکەم**

مانای گەندەڵی بەڕێوەبردنو ماددی: گەندەڵی زاراوەیەکە زۆر مانا دەگرێتە خۆی، خراپەکاری لە هەموو کەرتەکانی حکومەت بوونی هەیە، هەروەها لە کەرتی تایبەتی. لە هەر ڕێکخراوێك بوونی هەیە، کاتێك کەسێك دەبێتە هێزی دەسەڵاتدارو دەبێتە هێزی دەستبەسەرداگرتن بەسەر کەلوپەلێك، یان خزمەتێك، یان خاوەن بڕیارێك، سەربەخۆیی دیاریکردنی کەسەکان ئەوانەی خزمەتێك، یان کەلو پەلێك دەگرنە ئەستۆ، بڕیار تەنها بۆ کۆمەڵە کەسێکە بێ لە کەسانی تر، زاراوەی گەندەڵی بەڕێوەبردن چەند تەوەرەیەکی هەیە:

١- گەندەڵی سیاسی: ئەمەش دەردەکەوێت لە سیاسەتی ئەندامی حیزبێك، یان ڕێکخراوێك، لە ئەنجامی هەستکردنی بەهێزو دەسەڵاتی تاکە کەسی خۆی بە باوەڕی خۆی کە بەهێزترین کەسە، یاخود فرۆشتنی هەموو بیروباوەڕی دانراو لە ئەدەبی ڕێکخراوێك بۆ بەرژەوەندی چەند کوتلەیەکی دەوڵەتیو هەرێمیو نەتەوەیی، بە هۆیەك، یان زیاتر لە هۆیەك، لەمانەش: خیانەتکردن، بێ ئاگابوون، گوێنەدان، نەزانین، پاڵەپەستۆ ....هتد.

٢- گەندەڵی بەڕێوەبردن: ئەمە بەدەردەکەوێت لە ئەنجامی خراپەکاریو لاری بەڕێوەبردنو کارکردن لە ڕێگای ڕێکخراو، کەوا لە فەرمانبەری گشتی دەکات لە کاتی کارکردندا پابەند نەبێت بە یاساکان، بنەماکانی تەشریعی، پاراستنی یاسای تاکەکەسی، ئەمەش دەبێتە هۆی ئیستغلالکردنی فەرمانبەرانی حکومی لە شوێنی خۆیان، بۆ هێنانەدی چەند دەستکەوتو بەرژەوەندی بە ڕێگای نا شەرعی.

٣- گەندەڵی دارایی: دیاردەکانی لادانی داراییو جێبەجێنەکردنی یاساکانو لە ڕێکخراوە حکومییەکانو لادان لە چاودێریکردنی دارایی.

٤- گەندەڵی ڕەوشتی: دەردەکەوێت لە لادانی ڕەوشتیو هەڵسوکەوتی تاکەکەسی کە پابەند نییە بە ئاینو دابو نەریتی کۆمەڵایەتییەوە.

**بەندی دووەم: جۆرەکانی گەندەڵی بە پێی قەبارە:**

١- گەندەڵی بچووك (گەندەڵی نرخەکانی کار): ئەو گەندەڵییە تاکەکەس ئەنجامی دەدات، بەبێ بەرنامە لەگەڵ کەسانی تردا. بۆیە ئەم بەربڵاوە لە نێو فەرمانبەرە بچووکەکانە کاتێك بەرتیل وەردەگرن لە کەسانی تر.

٢- گەندەڵی گەورە، (گەندەڵی پلە بەرزەکانی کار: ئەم گەندەڵییە گەورە، بەرپرسانو فەرمانبەران ئەنجامی دەدەن بۆ وەدەستهێنانی ئەو شتەی مەبەستیانە.

**بەندی سێیەم:**

هۆیەکانی گەندەڵی و کارتێکردنی:

١- هۆیەکانی سیاسی: مەبەست لە هۆیەکانی سیاسی ئەوەیە نەبوونی ئازادی ڕژێمی دیموکراتی لە چوار چێوەی دەزگای کۆمەڵگەی مەدەنی، لاواز بوونی ڕاگەیاندنو چاودێریکردن.

٢- هۆیەکانی کۆمەڵایەتی: بریتییە لەشەڕو شۆڕشەکانو ئاکامەکانی لە کۆمەڵگاو دەستتێوەردانی دەرەکی تایەفەگەریو مەزاهب و نیگەرانی لە نەبوونی ئاسوودە، ترسی لە داهاتووی نادیارو کۆکردنەوەی سامان بە هەر ڕێگایەك بێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوارۆژو داهاتووی نادیار.

٣- هۆیەکانی ئابووری: بارودۆخی ئابووری خراپ پاڵ بە تاکەکەسەوە دەنێت بۆ گەندەڵیو زیادبوونی نارەحەتییەکانی ژیان و بژێوی ڕۆژانە.

٤- هۆیەکانی بەڕێوەبردنو ڕێکخستن: بەدەردەکەوێت لە کردارە ئاڵۆزەکانیو شێواوونادیاری جێبەجێکردنو کارنەکردن لە ناو دەزگاکاندا بۆ پشت نەبەستنی بەکەسی لێهاتوو لە لایەن بەڕێوەبردنەوە.

ئا: نەریمان بەهرام




# کارگێڕی ئیلکترۆنی



بەشی پێنجەم

**یەکەم: ئامانجی کارگێڕی ئیلکترۆنی:**

**١- بەرزکردنەوەی ئاستی زیرەکی و چالاککردنی کارەکانو گەیاندنو بە جێهێنان لەناو بەشەکانی دەوڵەتدا.**

- باشکردنی ئاستی زیرەکی لە بەکارهێناندا.
- کەمکردنەوەی کاتی پێویست لە جێبەجێکردن لە نێوان هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکدا.
- سوود وەرگرتن لە تاقیکردنەوە نموونەییەکان لە کارکردندا.
- سەرنجدان لە بەدەستهێنان لە کارەکاندا.

**٢- کەمکردنەوەی تێچوونی دەوڵەت بەم ڕێگایانەی خوارەوە:**

- چاککردنوپێشخستنی بواری ئەندازیاری کارەکان.
- ئاسانکاری ڕوونیو شەفافیەت لە کارەکان.
- کەمکردنەوەی ئەو زانیاریانەی کە دووبارە دەبنەوە.
- هاندانی یەکەکانو تەواوکارەکانو ئاڵوگۆڕکردنیان لە نێوان زانیارییەکاندا.

٣- بەرزکردنەوەی ئاستی سوودوەرگرتن لەو پرۆژانەی کە پێشکەشیان دەکرێت.

- ئاسانکاری لە پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی حکومەتدا.
- کەمکردنەوەی کات بۆ گەیشتن بە خزمەتگوزاری پێویست.
- پێشکەشکردنی زانیارییە تەواوەکان لە کاتی گونجاندندا بە گوێرەی پێویست.

٤- پشتگیریکردن لە پرۆگرامی پێشکەوتنی ئابووری دەوڵەوت.

- ئاسانکردنی هەڵسوکەوتکردن لە نێوان کەرتی حکومیو کەرتی تایبەتدا.
- کەمکردنەوەی بڕی تێچوونو چاودێریکردنی تەواو.
- هاندانی بۆ دروستکردنی بیناو باڵەخانە.
- دەرگا واڵاکردن بۆ بەرهەمهێنانی تازە.
- لێکۆڵینەوە بە پلەی بەرزو تەواو لە نێوان پرۆژەکانی حکومەتو کەرتی تایبەتدا کە خزمەت بە بواری ئابووری دەکات.
- ڕێکخستنی پسپۆڕیو زانیاریو زیرەکی.
- ڕێکخستنی پێشکەوتنو کرداری بەرهەمهێنان.
- ڕێکخستنو هێنانەدی پلاندانانو بەرهەمهێنان.
- ڕێکخستن و پێشخستنی کارەکان لە ڕووی دابەشکردنو گشتگیرییەوە.
- جێگەی فرۆشتنی ئەلکترۆنی.
- جێگەی بازرگانی ئەلکترۆنی.
- ڕێکخستنو هێنانەدی بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندییەکان.
- ڕێکخستنو پێشکەوتنی پەیوەندی نێوان دامەزراوەکان.
- بانکەکانی نێودەوڵەتی.
- کۆمەڵگای بازرگانی جیهانی.
- کۆمەڵگای بازرگانی شتوومەك.

**٥- خەسڵەتەکانی بەڕێوەبەری ئەلکترۆنی:**

- داهێنان: توانای داهێنانی هەبێت.
- زانیاری: زانیاری تازەو نوێی لادەست بکەوێت.
- کەسێکی زیندوو چالاك بێت.
- ڕێکخستنی فکرەو هزری دامەزراوە..

**دووەم: بەڕێوەبردنی کارەکان لە کارگێڕی ئەلکترۆنیدا:**

**١-پلانی ئەلکترۆنی:** زاراوەی پلاندانان زارەوەیەکی زۆر باوە، نەك هەر لە بواری زانستی ئابووریدا، بەڵکو لە بواری زانستە ڕامیاریو کۆمەڵایەتیو کارگێڕییەکانیشدا، زارەوەیەکی بیستراوەو کاریگەرە لە وڵاتانی پێشکەوتوو، گەشەکردوودا.

**پلاندانان:** کارێکی مرۆڤایەتییە، پەیوەندی بە هەوڵدان بۆ نەخشەکێشانی ڕێچکەکانی دوا ڕۆژەوە هەیە، لە ژیانی تایبەتو گشتی لە هەموو ڕێکخراوەو دامەزراوە گشتییەکاندا.

لە (بواری کارگێڕی)دا لە وەسفکردنی پلاندانانەدا (هێنری فایل) دەڵێت: (پلاندانان بریتییە لە پێشبینی دوا ڕۆژو خۆ ئامادەکردن بۆی).

پلاندانان ئەو چالاکییەیە کە کەسێك دەگوازێتەوە لە باری ئێستاوە بۆ ئەو بارەی کە دەیەوێت پێی بگات، ئەوەش بە پشتبەستن بە پلانو بەرنامەڕێژی جیاواز.

بەشێوەیەکی گشتی پلانی ئەلکترۆنی هیچ جیاوازییەکی نییە، لەگەڵ پلاندانانی شێوازی کۆن، ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی تەماشای بکەین هەردوو جۆریان لە ڕووی ناوەڕۆكو ئامانجو هۆکاری توێژینەوە لە ئامانجەکانیان یەك شتە.

بەڵام جیاوازی سەرەکی هەیە لەم سێ بوارەی خوارەوەدا:

**١- پلانی ئەلکترۆنی:** بریتییە لە کرداری فیزیایی لە ڕوانگەی ئامانجە فراوانەکانیو نەرمونیانیو لە سەرخۆییو کورتی ماوەکەشی لەگەڵ توانای دیاریکردنو گەشەپێدانی بەردەوام کە ناسنامەی سەرەکییەتی بە پێچەوانەی پلانی شێوازی کۆن کە ئامانجەکانی بەخراپ دەشکێتەوە لە سەر تواناو بلیمەتی پلاندانان.

**٢- زانیارییە ژمارەییەکان:** بە شێوەی بەردەوام دەڕژێت کە ناسنامەی سەرەکی بەردەوامبوونی هەموو شتێکی لە کۆمپانیادا هەتا پلاندانیشی کە وای لێدەکات لە پلاندانانێکی کاتی پچڕاو (دانانی ڕاپۆرتی وەرزی) دەکاتە پلاندانانی بەردەوام.

**٣- بیرۆکەی دابەشکردنی کاری کارگێڕی کۆن لە نێوان کارگێڕی پلاندانانو بەرپرسیارێتی هێلێ پێشەوەی جێبەجێکردن:** دەتوانرێت بە هۆی، یاخود لە ژێر ڕۆشنایی کارگێڕی ئەلکترۆنی چارەسەر بکرێت، بۆیە هەموو ئەو کەسانەی کە کار دەکەن لە هێڵی پێشەوەی کارگێڕییەکان دەتوانن بەشداری بکەن، یاخود بەشدار بن لە پلاندانانی ئەلکترۆنی لەگەڵ هەموو بیروبۆچوونێك کە خۆی دەبەخشێت لە شوێنە جیاوازەکانو گشت کاتەکان بۆئەوەی ببێتە مۆڵەتی کارکردن. جا بۆیە ئەم بەراورد کردنە وادەبنێرێت کە پەیوەندە بە دابەشکردنی کاری کارگێڕی کۆن، هەر وەك ئاماژەمان پێدا (بیرۆکەی تایلۆری چوار) لەگەڵ بۆچوونەکانی پلاندانانی ئەلکترۆنییە.

**٢- ڕێکخستنی ئەلکترۆنی:**

نزیکەی سەد ساڵ لە پەرەسەندنی بواری بەڕێوەبردن، لە جەوهەری ڕاستەقینەدا پەرەسەندن بووە لە ڕێکخستن (کە سەخترین هێزە لە بەڕێوەبردندا) ئەگەر پلاندانان زۆرترین پەیوەندی بە کاتەوە هەبێت لە ڕووی دانانی پلانی پەیوەست بەو هەوڵو کۆششەش کە کۆمپانیا دەیدات بۆ ئامانجەکان و دیاریکردنی ئامرازی پێویست بۆ وەدیهێنانی لە ماوەی داهاتوو(ماوەی پلان)، ئەوە ڕێکخستن زۆرترین پەیوەندی بە شوێنەوە هەیە لە ڕووی هەیکەلی ڕێکخراوەییو زنجیرەی فرمانەکان لە سەر ئاستەکانی ڕێکخراوەیی (پەیوەندی نێوان سەرو خواروو)، فەرمی بوونی ڕێکخراوەیی کە ئەمەیان زیاتر چڕ دەبێتەوە لە ناوەوەی کۆمپانیا چڕی کەمتر لە دەرەوەی کۆمپانیادا.

**ڕێکخستن:** بریتییە لە ڕیزبەندی چالاکییەکان بەشێوەیەك کە بەشدارە لە وەدیهێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە.

**٣- سەرکردایەتی ئەلکترۆنی:**

سەرکردایەتی لە ڕابردوودا ڕووبەڕووی دووئاستەنگی بنچینەیی بووەوە، ئەوانیش ئەرکو کارکەران، ئەم دوو ئاستەنگە، کاتو گرنگی پێدانی بەڕێوەبردن دابەش دەکات، هەروەها عەقڵو دڵی کارکەران.

ئەم دوو ئاستەنگە، لەگەڵ پەرەسەندنی بیری بەڕێوەبردن، بووە هۆی دەرکەوتنی دوو دەروازە:

**یەکەمیان: دەروازەی چەق بەستوو لە سەر ئەرك:** ئەو دەروازە توندو بە هێزەیی سەرکردایەتییە کە لە سەر هێزی ڕێکخستن وەستاوە کە خۆی لە هێزی سەنتەری بەڕێوەبردن، هێزی شەرعییەت (پەیوەستە بە دەسەڵاتی فەرمی) هێزی ستەمگەری، هێزی زانیارییەکان تا ئەوە سەرکردایەتی جێبەجێکارییە، ئەمەش ئەو سەرکردایەتییە تەرکیز دەکاتە سەر ئەرکەکان.

**دووەم: دەروازەی چەق بەستوو لەسەر دوو فاکتەرەکە بریتین لە:** دەروازەی نەرمو نیان، کە پەیوەستە بەهێزی کەسێتیو هێزی پەیوەندی نێوان سەرکردەو خواستی خۆیو قبوڵکردنی خوارو بۆ سەرکردەکەیانو کاریگەری ئەو لە سەر ئەوان. ئەم سەرکردەیە نزیکترە لە دوو فاکتەرەکە. بەو پێیە کە سەرچاوەی ئەوەی چاوەڕوانکراوە لە ڕێکخراوەکە. تا ئەمە دەروازەیەکە ئاڕاستەکراوە بۆ چالاکبوون، واتە ئەنجامدانی شتی ڕاستەقینە.

لەگەڵ ئەوەش کە ئەم دوو دەروازەیە بە گشتی هەموو ئەو پەرەسەندنە کۆدەکاتەوە کە لە ماوەی نزیکەی زیاتر لە سەدەیەکەوە وەدیهاتووە لە بواری سەرکردایەتیدا، بەڵام بێ ویژدانییەو بگرە ئەم خستنەڕووە خێرایە گونجاو نییە ئەم توانایە قبوڵو فراوانو جۆراوجۆری کە لە سەردەمی ڕابردوودا بەدەستهاتووە، کورت بکرێتەوە. ئەمەش چی لە بارەی چەمکەکان تیۆرەکان باشترین پراکتیك، یاخود وانەی سودمەند کە پەیوەندی بە سەرکردایەتییەوە هەیە. سەرکردایەتی لە ڕوانگەی تەقلیدەوە (کەپێش سەرکردەی ئەلکترۆنی دەکەوێت) لە سەر کلتورێکی دەوڵەمەند وەستاوە، ناکرێت فەزلەکەی بۆ بگێڕێتەوە. لەو دەسکەوتانەی لە بواری توانای ئەدای کارەکان، یان لە بواری کارابوون (ئامانجەکان، فاکتەرەکان).

**٤- چاودێری ئەلکترۆنی:** یەکێك لەو تایبەدمەندییانەی کە چاودێری لاساییکردنەوەی پێدەناسرێتەوە، ئەو چاودێرییەیە کە ئاڕاستەی ڕابردو کراوە. ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چاودێری لە قۆناغێکدایە کە لە دوای پلاندانانو جێبەجێکردن دێت. چونکە پرۆسەی بەڕێوەبردن پێکدێت لە:

**١-پلاندانان:** دیاریکردنی ئامانجو پێوەرەکانی بەڕێوەبردن.

**٢- جێبەجێکردن:** هەموو چالاکییەکانو ئاوازەکان لە (ڕێکخستن، هەماهەنگی، ئاڕاستەکاری) بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکان، پێوەرە پلان بۆ دارێژراوەکان).

**٣- چاودێری:** بەراورد لە نێوان پلاندانانو (ئامانجەکان، پێوەرە پلان بۆ دارێژراوەکان)، جێبەجێکردن ئەدای بە کردەوە بۆ وەدەستهێنانی ئامانجەکانو پێوەرە پلان بۆ دارێژراوەکان. دواتر دیاریکردنی لادانو هۆیەکانی، هەروەها گرتنە بەری ڕێو شوێنی ڕاستو دروست.




# ٥٠ بیرۆکەی قەشەنگ بۆ ڕێکخستنی هەموو شتێك

ن: شیری بایکۆسفی..
و. بۆ عەرەبی: محمد عنان..
و. بۆ کوردی: زانکۆ قەرەداغی

**چاکترین شێوازو کەرەستە بۆ ڕێکخستنی ژیانت، لە ئۆفیسو ماڵ، لە کاتی خوێندنو کارو سەفەرو بازاڕدا...**

**پێشەکی:**

ڕێکوپێکیت لە ماڵو نوسینگەو قوتابخانە، یان لە کاتی یاریکردندا، ڕەنگدانەوەی لەسەر ژیانت دەبێت، بە مانایەکی تر بەڕاستی گرنگی بە هەموو شتەکان دەدەیت، بۆ نموونە لە کاتی سەفەردا، دەزانیت چۆن ڕیکپۆشو شیکپۆش دەبیتو چۆن بۆچوونەکانت نمایش دەکەیت، لە هەر کۆبوونەوەیەکداو لە کاتو شوێنی پێویستدا ئامادە دەبیت، هەروەها دەزانیت چۆن پارێزگاری لە مەوعیدەکانت دەکەیت، ڕێکستنی خۆت واتلێدەکات مانای گرنگیدان بە خەڵکو ڕووداوەکان فێر بیت، ئەو کاتە بەردەوام لیستی کارە گرنگەکانت نوێ دەکەیتەوەو یادەوەرییە گرنگەکانت لە بیر دەبێت.

لە هەموو ئەمانە گرنگتر دەزانیت چۆن ئاگات لە خۆتو بیروبۆچوونەکانت بێت، بەهانەی گونجاوو ڕوون پێشکەش دەکەیت لە کاتی گفتوگۆدا، هەروەها فێری قسەی کورتو پڕ مانا دەبیت، بە مانایەکی تر ڕێکخستن برەودان بەشێوازەکانی ژیانت پێدەبەخشیو ژیانت ئاسودەو پڕ بەرهەم دەکات.

ئەم کتێبە بنەماکانی ڕێکخستن (ڕێکوپێککردن) دەخاتە ڕوو، بەشێوەیەکی گشتیو هاوکات لەگەڵ ئەزموونی پیادەکراو لەسەر ئەو بنەمایانە.

**بنەماکانی ڕێکخستن:**

**١-بیرکردنەوە (لەسەرەوە بۆ خوارەوە):**

ئەو شتانەی بە مەبەستی بەکارهێنان، یان دانانیان لە کۆگادا خەریکی ڕێکخستنیانیت، لەسەر شێوەی کۆمەڵو تۆپەڵ ڕێکیان مەخە، چونکە هەندێك لەو شتانە لەو جۆە دانانەدا دیارنامێنن، بۆ ڕێکخستنی فایلەکانت جێ فایلی هەڵواسراو بەکاربێنە، فایلە گرنگەکانت لەسەر شان دابنێ، ڕەفەو شیشی هەڵواسراو لەسەر دیوار بەکاربهێنە، دەکرێت سوود لەو لادیوارە وەرگریت، کە دەکەوێتە پشت دەرگای کەنتۆری جلەکانتەوە.

**٢- شوێنی کار:**

تاقیبکەرەوە کە بۆ هەر کارێکو تەنانەت بۆ بچوکترین کار، شوێنی تایبەتی خۆی بۆ دروست بکەیت، بۆ نموونە شوێنی نامە نووسینت، جێگای ئامادەکردنی، یان شتنی جلوبەرگ، زۆر گرنگە کە دیزاینی شوێنی کار گونجاو بێت، لەگەڵ ئەو کارەی کە تیایدا ئەنجام دەدرێت، ئاگاداری ئەوەش بە، ئەو کەرەستانەی پێویستە، نزیك دەستت بن، با ئامانجت ئەوە بێت کە شوێنکاری ئاسانو سازو سەرنجڕاکێشو ڕێکوپێك ساز بکەیت.

**٣- داهێنەر بە:**

بەناو ماڵەکەتدا بگەڕێ، ئایا تێبینی هەندێ شتی زیادو بێکەڵکت کردووە، کە پێویستت پێیان نییەو خەریکن لەناودەچن، بیربکەوە بە جۆرێکی تر، بەکاریان بهێنیت، بۆ نموونە سەبەتەی خۆڵی کۆن دەتوانیت بیکەیتە ئینجانە بۆ گوڵ، بۆ ئەلبومێکی کۆنی وێنە بکە، بەجێی پاراستنی ڕەچەتەی دەرمان، یان بۆ هەڵگرتنی پولی پۆستە بەکاری بێنە، تەنانەت دەفتەری یادنامەیەکی کۆن دەکرێت بۆ تۆمارکردنی تێبینیو کاری

ڕەشنوسی بەکارببرێت، گرنگ ئەوەیە کە سوود لە تواناکانی خۆت وەربگریت لە بواری بیرکردنەوەو ئەندێشەکردندا.

٤- دواجار لە کۆڵت بووەوە:

هەموو شت بەرواری بەسەرچوونی هەیە، دەبێت ئاگات لە بەرواری بەسەرچوونی ئەو شتانە بێت کە دەیانکڕیت، کاتێکی ڕێکخراوت هەبێت بۆ ڕزگاربوون لەو شتانەی بەرواریان بەسەر دەچێت، بە تایبەت دەرمانو مادده خۆراکییەکانو پڕوپاگەندە گەشتو گوزارییەکانو ڕۆژمێرو ئەو نامیلکانەی تایبەتن بە ڕێستورانتو کۆگا بازرگانییەکانەوە، یان چاپەمەنییەکانی وەك گۆڤارو ڕۆژنامەکان.

٥- پرەنسیپی کۆمەڵەکان:

هەر کۆمەڵە شتێك لە شوێنێکی تایبەت بپارێزە، وەك کۆمەڵەی جلوبەرگ، کەرەستەی چالێنان، کەلوپەلی یاریی، لە یادت بێت ئەو شتانەی پەیوەندیدارن بە هەر کۆمەڵەیەکەوە نزیك لێی دایانبنێی، بەمەش سوودی زیاترت دەستگیر دەبێت.

٦- داوای یارمەتی بکە:

ڕەنگە نەتوانیت بە تەنیا هەموو کارەکان ئەنجام بدەیت، داوای یارمەتی لە هاوڕێییەك بکە، بەرامبەر هاوکارییەکی تۆ بۆ ئەو لە داهاتوودا، یان کەسێك بە کرێ بگرە یارمەتیت بدات، ئەوەش بە گوێرەی ئەو کارەی کە دەیکەیتو بە گوێرەی توانای گیرفانت.

٧- ئەوان دەزانن کامە چاکترە:

ئەگەر نەتتوانی لە زەینی خۆتدا وێنای ڕێکخستنی شتێك بکەیت، بە شێوەی ڕاستو دروست، نەنگی نییە، کە بە شوێن نموونەیەکی چاکدا بگەڕێیت، بۆ ئەو مەبەستە، وەك ئەوەی سەردانی کۆگایەکی مۆسیقا بکەیت، یان بچیتە کۆگایەك کە کەلوپەل دێنێ و دەیفرۆشێ، لەو شوێنانەو لە شوێنانی تریش سەرنج بدە، ئەو بەدواداچوونو سەرنجدانە بیرۆکەی تازەت لا دروست دەکەنو ڕەنگدانەوەیان دەبێت لەسەر شێوازی ڕێکخستنت.

٨- یەك هەنگاو جێبەجێ بکە:

ئەگەر پێتوایە، ئەوەندە سەرقاڵی کە کاتی ڕێکخستنت نییە، ئەوا تۆ لەو کەسە زیاتر پێویستت بە ڕێکخستنە کە هێندە کاتی هەیە شتەکانی پەرشوبڵاوبکاتەوەو ڕێکیان بخاتەوە، چی دەبێت ئەگەر لەگەڵ گەشتنە ماڵەوەت چاکەتەکەت لە ناو کەنتۆری جلەکاندا هەڵواسیت؟

ئایا ئەمە باشتر نییە، لەوەی چاکەتەکەت فڕێدەیتە سەر نزیکترین کورسی، یان لەسەر زەوییەکەدا داینێیت، لە کاتێکدا ڕەنگە بتەوێت لەسەر ئەو کورسییە دانیشیت، یاخود ڕەنگە لە ئەنجامی لەسەر زەوی دانانەکە، پێویستی بە شۆردن بێت، دواجار لە ناو کەنتۆری جلەکاندا هەڵیبواسی.

لە ڕاستیدا بنەمای گشتی ئەوەیە کار لە کاتی خۆیدا بکەیتو بە کاتێکی کەم، چاکترە لەوەی ئیش دوابخەیتو کاتێکی زۆری پێوە بەسەر بەریت.

٩- ئەوە هەڵبژاردنی خۆتە:

فێربوون، یان پارێزگاری لە خووە چاکەکان، ئاسانترە لە ڕاستکردنەوەی خوی نادروست، ئەگەر دەستت بە کارێکی نوێ کرد، هەموو تواناکانت بەکاربێنە بۆئەوەی بە چاکترین شێواز بە ئەنجامی بگەیەنیت، نەك بە دەستییەوە دابمێنیت، -کە ئەمە زۆرجار ڕوودەدات- بیر لە کار بکەرەوە بە هەموو شێوازو ڕێگەیەك تا کارەکە بەرەو پێش بڕوات، بێ دوودڵی پرسیار لە پسپۆڕان بکە، دەست بە هیچ کارێك مەکە تا هەست نەکەیت، کە ئامادەیی تەواوت هەیە بۆ ئەو کارە.

١٠- نەخشەکەت بە ڕوونی بکێشە:

بە چاکیو پێش دەستپێکردن پلان دابنێ، بۆ هەر شتێك کە دەتەوێت ئەنجامی بدەیت، ئەو شتە کارێکی دیاریکراوە، یان چوونە بازاڕو شتکڕینە، یان سەفەرێکە، هەر کارێك بە درێژایی کاتی ئەو کارە وێنایەکی ڕوونیت لەبەرچاو نەبێت، کاتی زۆری دەوێت، هەروەها پلاندانان ڕێگە لە تەشەنەو پەرەسەندنی هەڵە دەگرێت، ناتوانیت بەبێ نەخشە لە شوێنی خۆت جووڵە بکەیت، نەخشە بۆ ژیان پێویستە، هەروەك چۆن لە کاتی شۆفێریدا پێویستە، پێویستیت بە سەرنجو سەیرکردنی لەسەرخۆ هەیە، چ لە تەنگژەکانی ژیاندا، یان کاتێك بە قەرەباڵغییەکی هاتوچۆدا ڕەتدەبیت.

١١- ئەوە بیرۆکەی منە:

دەتوانیت سیستەمێکی تایبەت بۆ خۆت دابنێی لە ژیاندا، خۆت دووربگرە، لەو شێوازە ئاڵۆزانەی خەڵکانی تر پەیڕەوی دەکەن، هەر شێوازێك بە چاکی لێی تێنەگەیشتبیتو لەگەڵ سروشتی تۆدا گونجاو نەبوو، پەیڕەوی لێ مەکە، ئەوەندەی لە تواناندا هەیە، سیستەمێکی تایبەت بۆ خۆت دابهێنە.

١٢- ڕێکخستنی زەینی: پێش دەرچوونت پشوویەکی کورت بدە، خۆت بۆ ڕێکخستنی بیرۆکەکانت، بزانە پێویستییەکانت چینو دەبێت چی لەگەڵ خۆت ببەیت؟

دەفتەری سپاردەی بانك، یان کارتی بە ئەندام بوون لە شوێنێك، یان کلیلی لۆکەرەکەت، لەو یانەیەی بۆی دەچیت؟

یان نەخشەی گەشتەکەت لە کاتی سەفەردا، یان دەفتەری چەکەکانت لە کاتی چوونتدا بۆ شتکڕینو بەوجۆرە.

١٣- کاری خێرخوازی تایبەت:

ئەگەر نیازت بوو هەندێ شتە کۆن فڕێ بدەیت، بە تایبەت ئەو شتانەی سۆزێکت بۆیان هەیە، یان پێتوایە، بە کەڵکی کەسانی دیکە دێن، بگەڕێ بە شوێن دامەزراوە خێرخوازییەکاندا، من خۆم بیستوومە دامەزراوەیەك هەیە کارتی داوەتنامەی کۆن کۆدەکاتەوەو تازەیان دەکاتەوەو دەیانفرۆشێت، پارەکەی دەخاتە سەرداهاتی دامەزراوەکە.

١٤- هەر شتەو لەجێی خۆیدا:

واباشە شت لەو شوێنانەدا هەڵبگیرێت کە ئەگەری بەکارهێنانی لێ هەیە، لە ڕەفەی سەرمێزی نووسینگەکەت ئەو شتانە دابنێ کە ڕۆژانە بەکاریان دەهێنیت، وەك پێنووسو کاغەزو پول، بەڵام کەلوپەلی پاکژکردنەوەی گەرماو دەبێت لە گەرماودا دابنرێت، کەرەستەی خواردن ئامادەکردنیش لە چێشتخانە، یان نزیك لە ژووری نانخواردن دادەنرێت، کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنیش لەسەر، یان نزیك تەلەفزیۆن دادەنرێت.

١٥- ئەمە ڕۆژەکەیە:

لە ماڵەوە، یان لە شوێنی کارەکەت، یەکێ لە ڕۆژەکانی مانگ ناوبنێ (ڕۆژی ڕێکخستن)، کاتو شوێنی ڕێکخستنی مانگانەت لە ناو لیستی کارە گرنگەکانتدا بنووسە، کۆششی تەواو بکە، لە پێناو چالاکی زیاتردا، کات بقۆزەرەوە بۆ ڕێکخستنی ڕووی مێزو ڕەفەکانو خۆت لە شتە زیادەکان، ڕزگار بکەو کتێبخانەکەت ڕێکبخە.

١٦- زۆرشێوازی ڕێکخستن هەن یارمەتیت دەدەن بۆ سوودوەرگرتنی زیاتر لە کاتو چاکتر بەڕێوەچوونی ئیشوکارەکانت، لە ماڵەوەو لە نووسینگە، بەڵام!! وریابە بە شێوازەکانی ڕێکخستن زیاد لە پێویست بەکارنەهێنانی، چونکە هەندێجار سادەیی چاکترە لەوەی شتەکان لە خۆت ئاڵۆز بکەیت.

# حکومەتەکان گێلن، یان خۆیان گێل دەکەن؟!

نەسیم سەمادی



گەرچی حکومەتەکان بە زرنگو زیرەك دەربکەون، بەڵام لە ڕاستیدا گێلن.

زۆربەی حکومەتەکان گێلانە کار دەکەنو تەنها کەمێکیان توانای هاوڵاتییەکانی خۆیانیان سازاندووەو لێیان گەڕاون، تا کار بکەنو داهێنان بهێننە ئاراوە. بەوەش هزرو هۆشی خۆیان لە خەموپەژارە، ئاسودەو ئەرخەیان کردووەو بۆ خۆیان لێی دانیشتوونو قاچیان لەسەر قاچ داناوەو پێدەکەنن.

ئەرێ حکومەتتان دیوە، پێ بکەنێت؟! حکومەتەکان لە سەنگافوورە، تورکیا، مالیزیا، ئوسترالیا، ئەسیتۆنیاو چین، لەسەر کورسی پانوپۆڕو نەرمونۆڵ لێی دانیشتوونو سەرنجی گەلەکانیان دەدەن، کە کاردەکەنو خۆشیان پێدەکەنن. هەرچی حکومەتەکانی تونس، لیبیا، میسر، عێراق، سوریا، یەمەن، لوبنان، سودان، ئەردەن، ئایسلەندە، یۆنان، ئێران، ئەفغانستان، پاکستانو ئەمریکایشە.. لەتاو توندیی گێلییەکەیان، هۆن هۆن فرمێسك هەڵدەڕێژن، چونکە هێشتا لەوە تێنەگەیشتوون، کە بیروبۆچوونە خاووخلیچکەکانی سەردەمانی ڕابردوو، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەلومەرجە پڕکێشمەکێشو ئاڵۆزەی ئێستە، دەست نادات.

حکومەتەکان لە کۆندا، بایەخیان بە سنوورو سوپاو جوگرافیاو مێژوو دەدا. ئەمڕۆکەش حکومەتە نوێیەکان، بایەخ بە سەرچاوە ورەو واتاییەکان دەدەن. وەك: متمانە، بەختەوەری، زانیاری، ڕوونیو ئازادی. ئەو پێکەوەبوونەشی لە نێوان بەڕێوەبردنی حکومەتو زانیاریدا هەیە، لە نێوان دەسەڵاتو بەرنامەڕێژیدا هەیە، لە نێوان تەکنەلۆژیاو سەرکردایەتیدا هەیە، پێکەوەبوونێکی ساختەو پیتاندنێکی دەسکرد بووە، چونکە حکومەتەکان ئێستەشی لەگەڵدا بێت، ئاسانترین چارەسەر هەڵدەبژێرن، نەك باشترین چارەسەر.

بۆ نموونە: ئەوە گەورەترین دەوڵەتو زلهێزی جیهانە، گرفتە ئابوورییەکانی بە ئازارشکێنەکان چارەسەر دەکات.

وزەکانی خۆی بە فیڕۆ دەداتو هەر دوو پارتە کۆماریو دیموکراسییەکەشی، بێهوودەو بۆ ماوەی چەند مانگێك دانوستان دەکەن. پاشان بۆئەوەی لە مایەپووچی قوتار بن، پەنا دەبەنە بەر ئەو چارەسەرە ناوەنجییەی، هەموو لایەك بە دڵیانەو ئەو چارەسەرە دروستەش هەڵنابژێرن، کە لە دووربینیو بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی دادگەردا خۆی دەنوێنێت.

تا ئەندازەیەکی زۆر، هەموو حکومەتەکان.. لە بری بەگەڕخستنی ڕێوشوێنی دوور مەودا، کار بە شێوازە کورت مەوداکان دەکەن. تەنانەت ئەو حکومەتە دیموکراتییەشی بە زرنگو زیرەك دەردەکەوێت، پەند لە هەڵەکانی خۆی وەرناگرێت.. ئەمە لە کاتێکدایە ئەو ڕێگەیە دەبینێت، کە خێرا بەرەو شکستی دەبات. دەوڵەتە نوێیەکانیش بە هۆی زۆرێك لە یاساو ڕێسا شکستخواردووەکانەوە، ڕووبەڕووی شکست دەبنەوە.

حکومەتەکان گێلن.. چونکە خۆگێلکردنو چاوی خۆنووقاندن، خۆخەڵەتاندنی تێدایە، گێل بایەخ بە ئایندە نادات، بەو هۆیەوە سەرچاوەکانی داهاتی خۆی، لەناو دەباتو گوێی خۆی لە ئاکامە خراپەکانی دەخەوێنێت، تا دەسکەوتە خێراکان بەدەست بهێنێت.

زۆربەی دەوڵەتان، زێدەڕۆیی لەو شتەی لە مەودای کورتدا بەدی دەهێنرێت، دەکەنو لە شانو شکۆی ئەو شتەشی لە مەودای درێژدا بەدی دەهێنرێت، کەم دەکەنەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، درەخت دەبڕنەوە، تا بەرهەم بچننەوە. هەمووان بەسەرهاتی ئەو جووتیارە دەزانین، کە مریشکەکەی هێلکەی زێڕینی دەکرد، دواتر سەری بڕی.. تا بە جارێك سەرجەم زێڕەکە، لە هەناویدا دەربهێنێت. سەرەنجامیش هەر بێهیواییەکی کتوپڕو بەدبەختییەکی هەمیشەیی، بوو بە بەشی.

دەی لەبەرچی هەموو حکومەتەکان، ڕەتی دەکەنەوە فێرببنو پەند وەربگرن؟ بۆچی هۆکاری بوونی خۆیان، لە خۆیان ناپرسن؟ ئەگەر حکومەت، لە نهێنیی بوونی خۆی دەپرسی، ئامانجەکانی خۆی دەزانی، لەوەش دەگەیشت، پێویستە چی ئەنجام بداتو چۆنیش ئەنجامی بدات؟! ئەو کارە دروستەش کامەیە، کە دەبێت بەردەوام بێت؟! چ شتێکیش شیاوی چاوپێداخشاندنەوەیە؟!

حکومەتەکان گێلن، چونکە خۆ گێل دەکەن، قیبلەنماو بڕوابوون بە ڕۆڵی خۆیان لە دەست دەدەنو لە بری ئەوەی چمکی گوریسەکە بگرنو دەسەڵاتو زانیاری، لە خزمەتی خەڵکدا دابنێن.. ڕوو لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانو ڕێوشوێنە نەخوازراوەکانو بڕیارە تاکڕەوییەکان دەکەن، ئیدی ڕۆڵەکەیان نامێنێتو سەردەنێنەوەو دواییان دێت.



ئا: محەممەد مێرگەیی

# چی دەکەیت بۆ پارێزگاری خاوێنی خۆت؟

پارێزگاریی پاکوخاوێنی کەسیی خۆت، بەشێکی گرنگ پێکدەهێنێت لە پارێزگاریی تەندروستیتو هەروەها یارمەتیدانت لە هەستکردن بە ڕازیبوون لە خۆت.

ئایا هیچ ڕۆژێك چوویتە پۆلێکی قەرەباڵغی پەنجەرە داخراو؟ بێگومان لەو بارەدا بۆنێکی ناخۆش هەستی پێدەکرێت. بە گوێرەی بیروڕای شارەزایان، منداڵانیش لەشیان ئارەق دەکاتەوە، بەڵام جەستەی ئەوان، وەکو جەستەی گەورەکان بۆنی ئارەقی لێوە دروست نابێت، تاکو دەگەنە تەمەنی پێگەیشتنو باڵغبوون. کەواتە ئەی ئەو بۆنە چییە کە لە بچووکو منداڵانەوە پەیدا دەبێت؟

جلوبەرگ:

* تەنانەت ئەگەر تۆ بەشێوەیەکی زۆریش ئارەق نەکەیتەوە، بەڵام جلوبەرگت هەر تووشی پیسیو چڵکو پەڵە دەبێتەوە، بۆیە دەبێت بە بەردەوامی بگۆڕدرێن.

* جلوبەرگەکانی ناوەوە بە هۆی نزیکییان لە پێستەوە، هەڵدەستن بە کۆکردنەوەی خانە مردووەکانی پێستو ئارەقو پەڵەی جۆراوجۆر. بەکتریای شەوانەش هەڵدەستێت بە کارکردن لەسەر ئەو پەڵانە، بەمەش بۆنی جلوبەرگەکان دەگۆڕێتو جوانو بۆنخۆش نامێنێت، بۆ پۆشینیان لە ڕۆژی دواتردا، بۆیە پێویست دەکات ڕۆژانە بگۆڕدرێن.

* پێویستە هەر کە گەیشتیتەوە ماڵ، جلوبەرگی قوتابخانەت داکەنیو لە شوێنێکی وەهادا هەڵیواسی کە هەواگۆڕکێیەکی باشی هەبێت، بەرلەوەی بۆ ڕۆژی دواتر بیپۆشیتەوە.

* داوا لە ئەندامانی جگەرەکێشی نێو خێزانەکەت بکە، لە ماڵەوەو لە ناو ئۆتۆمبێلدا، جگەرەنەکێشن، چونکە ئەم کارە جگە لەوەی زیانی زۆری هەیە بۆ سەر تەندروستی، دووکەڵەکەشی دەچێتە ناو جلوبەرگەکانو بۆنەکەیان ناخۆش دەکات.

پێڵاوەکان:

*ڕۆژانە کاتێکی زۆر لەسەر پێییەکانت دەوەستیتو پێڵاوەکانت زۆر نزیکن لەو شوێنەی غودەی ئارەقەڕژێنیان تێدا زۆرە، کە ئەوانیش پێیەکانن.

* ئارەقی پێیەکانت دەچێتە نێو پێڵاوەکانتەوە، پاشان بەکتریاش کە حەز لە قوماشو پێستە شێدارەکان دەکات دەچێتە ناوییەوە.

*ئەگەر پێڵاوێکی تایبەت بە قوتابخانەت هەیە، پێویستە هەر کە گەیشتیتە ماڵەوە یەکسەر دایانبکەنیتو بە درێژایی شەو هەواگۆڕکێی باشییان هەبێت.

* باشتروایە پێڵاوێکی تر هەبێت بۆ ئاڵوگۆڕکردنیان.

* پارێزگاریی لە پێڵاوەکان، چ بە خاوێنکردنەوە بێت، یا بۆیاخکردن، وای لێدەکات باشتر دیاربێت، هەروەها ماوەیەکی زیاتر بەکاری دەهێنیو لە هەمان کاتیشدا کەمتر تووشی دەردانی بۆنی ناخۆش دەبێت.

پێییەکان:

* پێویستە ڕۆژانە پێیەکانت بە باشی بشۆردرێنو وشك بکرێنەوە، بە تایبەت نێوانی پەنجەکان.

* ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر دەچیتە مەلەوانی، دەبێت زۆر وریابیت لە شووشتنی پێیەکانو نابێت بە پێخاوسی بڕۆیت.

قژو پرچ:

*لە شوێنی گەشەکردنی تاڵە موووەکانی قژ، ماددەیەکی چەوریی دەردەدرێت کە یارمەتیدەرە بۆ نەرمیی قژ، هەروەك لە پێستی سەردا غودەی ئارەقەڕژێن هەیەو خانەی مردووی پێست لە پێستی سەر دەردەچن. هەموو ئەم هۆکارانە وا لە قژ دەکەن کە چەورو پیس دیاربێت، ئەگەر ڕۆژانە نەیشۆیتو پاکی نەکەیتەوە.

* بۆ پارێزگاریی لە خاوێنی قژت، دەبێت بە ڕێکوپێکی بە ئاوو شامپۆ بیشۆیت، پێستی سەرت بە باشی هەڵگوشە، ئەمە دەبێتە هۆی لادانی خانە مردووەکانو چەوری زیادەو چڵکەکان، ئینجا بە باشی بە ئاو بیشۆ.

ددانەکان:

*پێویستە بە لای کەمەوە ڕۆژانە دووجار ددانەکانت بشۆیت، پێش خەوتنو دوای نانخواردنی بەیانیان.

* لە ڕۆژدا دەمت پڕ بکە لە ئاوو نێوانی ددانەکانت پاك بکەرەوە، لە هەر خواردنێك کە پێیانەوە نووساوە.

لە کۆتاییدا.. بە جەستەو لەشێکی خاوێنو پرچێکی خاوێنو جلوبەرگو پێڵاوێکی خاوێنەوە، هەست بە خۆشییەکی زۆر جوان دەکەیتو هاوڕێکانیشت بە نزیکبوون لە تۆ هەست بە خۆشی دەکەن، هەروەها پارێزگاریی بکە لە پاکوخاوێنی نینۆکی پەنجەکانی دەستو پێیەکانتو هەفتانە کورتیان بکەرەوە.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە ٢٢٨ ساڵی ٢٠١١

ئا: ئەسکەندەر ڕەحیم

# ڕازی نرخ



پەیوەندیی پچڕاو..

زۆرجار هەریەکە لە کۆمپانیاکان، بەو چاوە لە بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانیان دەڕوانن.. کە فەوارەیەکی بێهاوتایەو بایەخی ڕکابەریی تایبەتو چەند خاسییەتێکی جیاوازی هەیە، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە، کاتێك خودی کڕیار، ڕووبەڕووی دەیان شمەکی هەمەچەشنە دەبێتەوە.. ئەوا یەك هۆکار زەوتی بڕیاری کڕینی دەکات. ئەویش نرخە، کە وا دەکات هەروەك شمەکێك لەو شمەکانەی خراونەتە ڕوو، لە بەرهەمەکە بڕوانێت!

کۆمپانیاکان بە هەڵەدا دەچن، کاتێك شوێن ڕکابەری لە نرخدا دەکەونو پەنا دەبەنە بەر داشکاندنی نرخی بەرهەمەکانیان، تا بە لێشاو کڕیار ڕوویان تێ بکاتو داهاتیان زۆر بێت. جێی سەرنجە، ئەو کارە دەبێت بە هۆی داخورانی بەهای بەرهەمو پاشەکشێی نرخ.. بەڵکو لێڕابینینی کڕیار لە بەرهەمەکە کەم دەبێتەوەو تامەزۆییان بۆی نامێنێتو هەر پەرەپێدانێکیشی تێدا بکرێت، گوێی پێنادەن. ئەمەش دەبێت بە هۆی سەرهەڵدانی دیاردەی «بەشمەککردن». واتە: لە ڕووی دەروونییەوە، کڕیارەکە پەیوەندی لەگەڵ بەرهەمەکەدا، دەپچڕێتو نامێنێت، وەك کاڵایەکی ئاسایی بۆ بەکارهێنان لێی دەڕوانێت، چاوەڕێی هیچ تایبەتمەندییەکی ناوازەی لێناکاتو بڕیاری یەکلاکردنەوەش لای ئەو، هەر نرخ دیاری دەکات، چونکە بڕوای وایە، هەموو ئەو شمەکە یەکچەشنانەی دەخرێنە ڕوو، وەکیەکنو هیچ جیاوازییەکیش لە نێوان ئەم بەرهەمە، یان بەرهەمێکی دیکەدا نییە.

سا لەبەرئەوە، لە ڕێگەی هەموارکردنی ئەو تاکە کارتێکەرەی، کڕیار بایەخی پێدەدات، کە خودی نرخە، پەیوەندیی نێوان کڕیارو بەرهەمەکە دابڕێژەرەوە. ئەم کارەش دەتوانرێت بە یەکێك لەم چوار هونەرە، بەدی بهێنرێت:

١- پەیکەری نرخ: بۆ ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندێتی لە ڕکابەریدا، هەستە بە گۆڕینی پەیکەری نرخەکان، تا سەرنجی کڕیار بەرەو بەهای بەرهەمەکەو ئەو کەڵکەی جیای دەکاتەوە، لەوانەی ڕکابەران پێشکەشی دەکەن، ڕابکێشیت.

نموونەی ئەم هونەرەش: کۆمپانیای «گۆدیێر» کە تایبەتە بە تایەی ئۆتۆمبیل، هەستا بە دانانی نرخ لەسەر تایەکانی، بە پێی توانای ئەو کیلۆمەترانەی لە ڕێگەدا دەیبڕێت.. هەڵبەت ئەمە دوای ئەوە بوو.. کە کڕیاران ڕەتیان دەکردەوە، نرخێکی گەورەو گران، لە بەرامبەر ئەو هەوڵانەی کۆمپانیاکە بۆ درێژکردنەوەی تەمەنی تایەکان دەیدات، بدەن.

٢- زێدەڕۆیی لە نرخدا: بۆ خرۆشاندنی هەستی خۆوەردان، ئەگەر لە دانانی نرخی بەرهەمەکەتدا زێدەڕۆییت کرد، ئەوا دەتوانیت کڕیار بەرەو بەرهەمەکەت پەلکێش بکەیتو هەستی خۆوەردانی بخرۆشێنیت.

باشترین نموونەی بەرچاویش، کۆمپانیای «ئەپڵ»ە، کە هەمیشە نرخی بەرهەمەکانی بەرز دەکاتەوە، وێڕای ئەوەش ناوو ناوبانگەکەی خۆی دەپارێزێتو هەرچەندەش زەمینەی ڕکابەری دژوارتر بێت، یان باری ئابووری هەرەس بهێنێت، ئەو هەر زۆرترین فازانجو گەورەترین ڕێژەی کڕیار، بۆ خۆی دەچنێتەوە.

هەروەها کۆمپانیای «بێرت بیز»، کە تایبەتە بە بابەتی ئارایشتکاری، نرخی بەرهەمەکانی، بەچەشنێك بەرزکردەوە، کە کڕیارەکانی، زۆر لایان سەیر بوو، ئەمەش هەڵینان، تا لە هۆکاری ئەو گرانبوونە بپرسن. وەڵامی پرسیارەکەشیان ئاسان بوو: ئەم بەرزبوونەوەی نرخە، لەبەرئەوەیە، کە بەرهەمەکانی ئەم کۆمپانیایە، پێکهاتەی بنەڕەتییان، سروشتینو دۆستی ژینگەنو لە لایەن ئەو کۆمپانیایانەی پەیڕەوی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتییان گرتووەتە بەر، دروستکراوە. ئەم هونەرو ڕێوشوێنەش، کڕیار هەڵدەنێت، تا بە وردی لە بەرهەمەکە بڕوانێت، چونکە ڕێی تێدەچێت، چەند تایبەتمەندییەکی دیکەی تێدا هەبن، کە پێشتر بە بیریدا نەهاتوونو ڕەنگە ئێستە بۆی گرنگ بنو پاساوی ئەو بەرزبوونەوەی نرخەش بدەنەوە.

# نەیارانی فرۆشیار

**٣- پسوڵەی وردەکاری:** بۆ دەرخستنی چاکێتییە فەرامۆشکراوەکان، هەروەها لە دەستت دێت، نرخ بۆ پێکهاتەو وردەکارییە بناغەییەکانی دابەش بکەیت، تا کڕیار ئەو چاکێتییە گرنگانەی سەرنجی نەداون، بۆ ڕوون ببێتەوە.

هەر بۆ نموونە: یەکێك لە کۆمپانیاکانی فڕین، هەستا بە سەرپشککردنی کڕیارەکانی، لە نێوان دوو گەشتدا، گەشتێك بە بڕی ١٦٥$، لە هێڵێکی ناڕاستەوخۆدا، کەخواردنەوەی چایەك، یان قاوەیەكو تەماشاکردنی ئەڵقەیەك لە ئەڵقە کۆنەکانی تێدایە، گەشتەکەی دیکەش بە بڕی ٢١٥$، لە گەشتێکی ڕاستەوخۆدا، کە سەرجەم چاکێتییەکانی خۆشی بینین لە خواردنو کەرەستەکانی سەرگەرمیو خۆشگوزەرانی تێدایە. وەك: نیوەڕۆژمیەکی پڕچێژو تەماشاکردنی شەش کەناڵی هەمەڕەنگی تەلەفزیۆنی.

لە ئاکامدا زۆربەی کڕیارەکان، دووەم جۆری گەشتیان هەڵبژارد، چونکە خەڵکی، لە کاتی سەرپشککردندا، ئەگەر وردەکاری نرخەکەی نەزانن، سەرنج لە چاکێتییەکی دیاریکراو نادەن.

**٤- یەکنرخی:** بۆ تێگەیاندنی کەڵکی تایبەتی، هونەرو ڕێوشوێنی چوارەم، لە بە یەککردنی نرخەکانی کەرەستەیەك، کە چەند چەشنێکی هەیەو بە پێی هەستە جیاوازەکانی بەکاربەر نەخشەسازی بۆ کراوە، خۆی دەبینێتەوە. ئەمەش دەبێت بە هۆی ئەوەی کڕیارەکە، بە لەسەرخۆیی کەرەستەکانی دیاری بکاتو ئەو شتەش هەڵبژێرێت کە لەگەڵ خواستو پێداویستییەکانیدا پێکدێتەوە.

نموونەش بۆ ئەم هونەرو ڕێوشوێنە، زنجیرە فرۆشگەکانی میسرە بە ناوی «دوا هێشوو»، کە سەرجەم بەرهەمەکانی بە یەك نرخی نەگۆڕ دەفرۆشێت. ئەمەش سەرنجی کڕیارو بیرکردنەوەی لەو کەڵکەی دەستی دەکەوێت لە کڕینی بەرهەمەکە، مسۆگەر دەکاتو چیدی جەخت لەسەر دەستپێوەگرتن ناکاتەوە.

ئەو شتەشی سەرنجی کڕیار ڕادەکێشێت، ئەگەر لە خۆی بپرسێت، بریتییە لەم پرسیارە: (بایەخو بەهای ئەم بەرهەمە، لە لای من چییە؟) یان ئەم پرسیارە: (ئەم بەرهەمە، چ پێداویستییەکم بۆ دابین دەکات؟).. ئەم پرسینەش سەرلەنوێ، پەیوەندی لە نێوان فرۆشیارو کڕیاردا دەبووژێنێتەوە.

سەرچاوە: المختار الإداري. عدد: ١١٦

چەندە توانامان بەسەر تێکشکاندنی نەیارانی فرۆشیاردا هەبێت، هێندە سەرکەوتنمان زۆرتر دەبێت. ئەو نەیارانەش ئەمانەن:

**١- خۆبەزلزانی:** لە خۆباییبوونو خۆپەسەندی، وامان لێدەکات، پێمان وابێت: ئەوەی ئێمە دەیڵێین، زۆر لەوەی کڕیار دەیڵێت، گرنگترە. بە چەشنێك تایبەتمەندییەکانی بەرهەمەکە، یاخود شمەکەکە، لەبەردەکەینو زانیارییەکی زۆر، بەسەر سەری هەر کڕیارێکی چاوەڕوانکراودا، هەڵدەڕێژین.. کە هەڵە گەورەکەی بریتییە لەوەی، گوێمان بۆ ڕادەگرێت.

**٢- زۆربڵێیی:** فرۆشیارە هەرەباشەکان، باشدەزانن، زانینی ئاڕاستەکردنی پرسیاری دروست، زۆر لە وەڵامی ڕاست، باشترە. کەواتە: ئەوەی لێی دەدوێیت، بە ڕێکوپێکیو وردودرشتییەوە بیزانە.. وەهاش تێنەگەیت: زۆرگوتن، یەکسانە بە زۆرفرۆشتن.

**٣- خراپ گوێڕاگرتن:** کە زۆر دەڵێین، کەمیش گوێڕادەگرین. خۆ ئەگەر دەتەوێت، باش گوێ شل بکەیت، زۆر قسەکانت درێژ مەکەرەوە.. چونکە ئەو کەسەی زۆر قسە دەکات، جڵەوی وتوویژ قۆرخ دەکات. ڕوونیشە کێ زۆرتر گوێ ڕابگرێت، جڵەوی وتوویژ بە دەستەوە دەگرێت.

**٤- گریمانەدانان سەبارەت بەو شتانەی کڕیار بیری لێدەکاتەوە:** ئەو کاتەی ئێمە، باش گوێ ڕاناگرین، لە بری ئەوەی بەڕاستی بزانین، کڕیارەکانمان چییان دەوێت، وا دەزانین، باشدەزانین.. چییان دەوێت.

**٥- قسەکردن سەبارەت بەو شتانەی هیچ بۆ کڕیار گرنگ نییە:**

هەر شمەكو بەرهەمێك، کە باش دەخرێتە ڕوو، هەروەها لە بیست تایبەمەندی، کەمتری نییە، کۆڵێکی قورس دەخاتە سەر هۆشو گۆشی کڕیار. هەرچی کڕیاریشە، هەمیشە لەبەر چەند هۆکارێکی تایبەت بە خۆی، نەك لەبەر ئەو هۆکارانەی دەیانڵێین، شت دەکڕێت. کڕیار هاندەرێکی سەرەکی، یان دووانی دەوێت، تا لەسەر کڕین، هەڵی بنێت. قسەکردنیش لە هەرشتێکی دیکە، هزروهۆشی دەشێوێنێتو پەستیو بێزاری، ڕووی تێدەکات.

**٦- شکستهێنان لە دیاریکردنی هەڵوێستی کڕیاردا:**

کڕیار، یەکێك لەم سێ هەڵوێستە دەنوێنێت: پەسەندکردن، یان ڕەتکردنەوە، یاخود بایەخنەدان.

خۆ ئەگەر بزانیت، چۆن بە وردی، هەڵوێستی کڕیار، دیاری دەکەیت، یاخود بەشێوەیەکی دروست، چۆن وەڵامیان دەدەیتەوەو بەدەمیانەوە دەچیت.. ئەوا بۆ ئەنجامدانی ڕێککەوتنێك، هەر زوو لە ڕێی ڕاستدا دەبیت.

**٧- دیارینەکردنی ئامانج:** ئەگەر نەزانیت، بەرەو کوێ دەکەویتە سەر ڕێ، سا چۆن دەزانیت، گەیشتوویتە جێ. هەروەها ئەگەر دەریاوان نەزانێت، بەرەو چ کەنارو بەندەرێك دەڕوات.. ئەوا هیچ بایەك: کەڵکی بۆی نابێت.

**٨- نەنووسینی تێبینییەکان:**

ئەگەر ئەوەی بۆ کڕیار گرنگە، نەنووسین، ئەوا زوو لە بیرمان دەچێتو لەوەی وا دەزانین بۆی گرنگە، دەدوێین. چونکە بەهێزترین زەین، هەمیشە لە خراپترین مەرەکەب، لاوازترە.



# سەرکەوتن لە کاردا

وەهاب حەسیب محەممەد

سەرکەوتن دۆخێکی مرۆیانەیەو شکستیش بە هەمان شێوە، بەڵام بە بەراوردێکی سادە لە نێوانیاندا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە سەرکەوتن دۆخێکی مرۆیانەی دڵشادە، هەنگاوێکە بۆ پێشەوە، خۆ ئامادەکردنە بۆ سەرکەوتنێکی دیکە. بەڵام هەرچی نوشستە تەواو بە پێچەوانەوە، دۆخێکە بەرەودوا دەمانگێڕێتەوەو لەوانەیە چەندین هەنگاوی تری لەو چەشنەی بەدوادا بێت، جا هەستی پێبکەین، یان نا. کەواتە کام لەو دۆخانە هەڵدەبژێرین بێگومان کەس ئامادە نییە حاڵەتی شکست بکات بە هاوڕێی کارو ژیانی، بەڵکو هەموومان ڕووەو سەرکەوتن هەنگاو هەڵدەگرینو لە دەوری کۆدەبینەوە، ئەو سەرکەوتنەی هەموومان ئاواتمانە، خەونی پێوە دەبینین، بەڵام بەبێ ماندووبونو دوور لە پلاندانانو هەڵگرتنی هەنگاوی باش، بێگومان نەخێر چون سەرکەوتن لۆژیکە، دانابییە، کارکردنە، ڕەوشتە.

سەرکەوتن ئامانجێکە پێویستی بە هۆکارە بۆ بەدیهێنانی، ڕەنگە هۆکارەکان لەوپەڕی سادەییدابن، بەڵام هەندێکی دیکەیان بە پێچەوانەوە، ئەو نەتەوانەی کە نەوەکانی تێدەکۆشن بۆ سەرکەوتن لە ژیاندا، لە خوێندندا، لە کارەکانیاندا، جێگایەکی دیاریان دەبێت لەناو گەلاندا.

**کاری گونجاو:** سەرکەوتن پەیوەستە بە کارەوە، بەدەر لە کارکردن، سەرکەوتن مەحاڵە، جا ئەو کارە کاری جەستەو بازوو بێت، یاخود کاری هزرو مێشک، کەواتە چ کارێك بۆم گونجاوەو مەرجەکانی چین؟ چۆن ئەو کارە هەڵبژێرم کە مەبەستمە.

سەرەتا پێویستە هەموومان لەسەر بنەمایەك کۆدەنگبین، ئەویش بریتییە لەوەی هیچ کارێکی ڕاستەقینەی باش، یان خراپ نییە، بە واتایەکی تر هەر کارێك ئادەمیزاد هەڵیدەبژێرێت، کارێکی گونجاوو باشە، چون باوەڕی پێیەتیو بە خۆشەویستییەوە هەڵیبژاردووەو ئارەزوویەتیو پاڵنەرێتی لە ژیاندا بۆ سەپاندنی خودی خۆی، هەستدەکات تاکێکی کاراو بەسوودە لە کۆمەڵگاکەیداو باوەڕی وایە بەو کارە بەرپرسیارێتی خۆی بەرانبەر بە خێزان، بە کۆمەڵگا پیادە دەکات.

زۆرێك لە خەڵکی تێڕوانینو هەڵسەنگاندنی جیاوازیان هەیە، بۆ جۆری بڕوانامەو ئەو کارانەی مرۆڤ ئەنجامی دەدات، بۆ نموونە یەك تێڕوانین نییە بۆ هەڵگری بڕوانامەی پزیشکیو بڕوانامەی کشتوکاڵ، یان پیشەی بازرگانیو کاری کشتوکاڵ، کە بە چاوێکی کەمتر سەیر دەکرێت، لە کاتێکدا ئەم تێڕوانینو هەڵسەنگاندنانە دوورن لە بابەتیانەو ناڕاستن لە بڕیاردا.

**کۆڵەکەکانی سەرکەوتن:**

١- باوەڕ بە خودای پەروەدگارو یادکردنەوەی لە هەر هەنگاوێکدا کە دەنرێتو داوای خۆڕاگریو هێزو باوەڕ بە خۆبوون لە پەروەردگار بکەینو ڕێنماکارمان بێت لە ژیاندا تا سەرکەوتن، چون مەبەستی پەروەردگار لە دروستکردنی مرۆڤەکان سەرکەوتنە لە کاری ماددیو مەعنەویدا، ئەمەش کرۆکی ژیانی مرۆڤی سەرکەوتووە.

٢- ڕەزامەندی دایكو باوك، ڕاگرتنی هەستو سۆزیانو داوای نزاو پاڕانەوەیان لێبکرێت لای پەروەردگار، بە هیوای سەرکەوتن لە ژیاندا، دەبێت پەیوەندی سەرکەوتن بە ڕەزامەندی دایكو باوکەوە چی بێت؟! بێگومان ئەوان هۆکاری هاتنە دنیای ئێمەنو هیچ کەس حەزناکات لە ژیاندا لەو باشترو لە پێشتربین مەگەر دایكو باوك، ئەوان پاڵپشتو سەرخەری ڕاستەقینەی ئێمەن لە ژیانداو هەمیشە دڵسۆزترین کەسمانن. لەگەڵ ئەو ڕاستییانەشدا کاتێك ئەوان لەسەر چۆنێتیو تەواوکردنی کاتێك ڕێنماییمان دەکەن، ئێمە نیگەران دەبینو بەدەستێوەردان لە ژیانماندا گوزارشتی لێدەکەین، هاوکات تا کارو ئامانجەکانی کارەکانمان ڕوونو دیاربن، مایەی دڵنیاییو خۆشنودی باوانو هاوڕێکانمانە لە ژیانداو پێچەوانەکەشی ڕاستە.

٣- خۆشەویستی وڵاتو خزمەتکردنی ئەو کۆمەڵگایەیی تیایدا ژیان دەگوزەرێنین؛ وڵات ئامانجو ئاواتی هەموو تاکێکی هۆشیارە لە هەر بارودۆخێکدا بێت، پێشکەوتوو، یان پاشکەوتوو، چونکە هەموو تاکێك بەشێکە لەو وڵاتەی کە تێیدا نیشتەجێیە، بە واتایەکی تر وڵات خەڵکە، پاشان خاك، بۆ ڕاستی ئەم وتانە

تەماشای ئاوارەکان بکە لە تاراوگە، چی وایان لێدەکات لە یەکتری گردببنەوەو جۆرەها ڕێکخراوو دامەزراوە دروست بکەن، تەنانەت هەندێجار دیاسپۆرە (تاراوگە)جارێکی دیکە نەتەوە درووستدەکاتەوە، یان تەماشای کەسانی ئاوارە بکە، زۆرێکیان هەر ئەوەندەی دەرفەت هەبێتو هەلێکیان بۆ هەڵبکەوێت دەگەڕێنەوە باوەشی نیشتمانو خۆشیو نیعمەتەکانی تاراوگە دەکەن بە ڕابردووی ژیانیان. دەتوانین بڵێین سەرکەوتنمان لە ژیانو کاردا، دیارییەکە پێشکەش بە نیشتمان، کۆمەڵگا، داهاتووی دەکەین، ڕاستە سوودمەندی یەکەم خۆمانین، ئەوانیش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سوودمەند دەبن، لەو کارە، جا کارەکە بچووك، یان مەزن بێت.

٤- هەمیشە گەشبین بە: لەوانەیە هەندێجار لە ماددەیەکی خوێندندا دەرنەچین، یان لە پرۆژەیەك لەپرۆژەکانی ژیانمان، یاخود لە هەندێك کارەکانماندا سەرنەکەوین، بە هۆی بارودۆخێکەوە دوور لە توانامان، یاخود توانای ڕاستەقینەی خۆمانمان بۆ دەرنەکەوێت لەو بوارەداو لەوانەشە بە هۆی کەمتەرخەمی خۆمانەوە بێتو هەست بە ژێرکەوتن بکەین، ئەمە واتای چییەو چیدەگەیەنێت؟ خۆمان لە گۆشەی قەناعەتدا قەتیس بکەینو بە چاویلکەی ڕەش تەماشای دەوروبەرمان بکەینو بە کۆتایی گشت شتێکی دابنێین؟ بێگومان نەخێر چەندێك ئاسەواری ژێرکەوتن قورسو گران بێتو چەندبارە بێت لەسەرمان، پێویستە زیاتر پێداگرو مکوڕ بین لەسەر گەشبینی بەرانبەر بە ژیانو داهاتوو، ئەگەر هۆکارەکان پەیوەندی بە خودی خۆمانەوە هەبێت، دەبێت دووبارەی نەکەینەوەو ئەگەر هۆکارەکە دەرەکیش بوو، پێویستە بەسەریدا زاڵبینو تێیپەڕێنین. لێرەدا جێگای خۆیەتی ئەو ژمارە دیاریکراوەی زانایان بهێنینەوە یاد کە (بەرخی دولی) یان کۆپی کرد کارەکەیان ٨٩٠ جار ژێرکەوت، جاری ٨٩١ سەرکەوتنو بێهیوانەبوون. یان کاتێك سەرکردەی مەغۆلەکان جەنگیزخان دوای جەنگێکی دۆڕاو تەماشای کرد مێروولەیەك دەنکە گەنمێك کە لەکێشی خۆی قورسترە دەگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی بەرزو جار لە دوای جار شکست دەهێنێت، بەڵام ئەو هەر کۆڵنادات تا سەرەنجام دەنکە گەنمی گەیاندە شوێنی مەبەست، جەنگیزخان ئەم وانەیەی کرد بەسەرمەشق لە ژیانیداو دواجار چەندین جەنگی بردەوەو تاجی سەرکەوتنی خستە سەر.

نووسەر مستەفا صادق ڕەفاعی ئەم بۆچوونە کورتدەکاتەوە لە ڕستەیەکداو دەڵێت: «هەرکاتێك ئادەمزاد سەرکەوت دەڵێت وامکردو... هاوکات ئەگەر ژێرکەوت دەبێژێت قەدەرەو بێدەنگ دەبێت».

پێویستە لەسەرمان هەمیشە گەشبین بین بەرانبەر بە ژیانو ڕووەو ژیان بە جدیو لێبڕاوانە هەنگاو هەڵبگرینو چاوەڕوانی ئەو پێشهاتو دۆخە نائاساییو ئاستەنگانە بین کە دێنە ڕێمان، دەبێت بە ئارامیو لێبڕاوانە هەنگاو بنێین ڕووەو کۆشکی سەرکەوتن، چونکە ئەو ئاستەنگو پێشهاتانە لە هەر دۆخێكو هەرجارەی بەشێوەیەكو لەبەرگێکدا بەرانبەرمان ڕادەوەستن، بۆیە گەشبینی ژیانی نوێو لاوی هەمیشەیە، گیانی وورەی هاندەرە بۆ چالاکیو کارکردن، پێویستە پاشەکشە نەکەین بەرانبەر هەر ژێرکەوتنێك جا بچووك، یان گەورەبێت، بەڵکو پێویستە لە هۆکارەکانی تێبگەین تا دواتر خۆپارێزی لێبکەینو لەوەش گرنگتر گۆڕینی نوشستە بە سەرکەوتن، بەڵام گرنگی نەدان بەژێرکەوتن تا ڕادەیەکی زۆر یەکێکە لە دیاردەکانی گەشبینی، بەڵام ئەنجامەکەی لە خودی شکست گەورەتر دەکەوێت لەسەر کەسی شکستخواردوو، چون گرنگی بە نوشستو هۆکارەکانی نادات‌و ئامادەنییە وانەی نوێیان لێوە فێربێت بۆ ئایندە.

سەرکەوتن وەك هەرکارێکی ژیان پێویستی بە پێشەکییەو ئەم پێشەکییانە دەبن بە کۆمەڵێك بنەما، ئەستەمە بەدەر لەو پێشەکییانە قسە لەسەر سەرکەوتن بکرێت. ئەم بنەمایانە بریتین لە:

**١- بیرکردنەوەیەکی وردو درێژ بەر لە بڕیاردان:** شتەکان، یان ئامانجەکان کە خەون بەجێبەجێکردنیانەوە دەبینین، زۆرێك زۆرترن لەوەی لە توانادا بێت بیانژمێرین. بەڵام پێویستە ئەو ئامانجانە دیاری بکەین کە لەگەڵ تواناکانماندا گونجاونو دەتوانین جێبەجێیان بکەین بە تواناو لێهاتوییەوە؛ دۆزینەوەی تواناو لێهاتوویی کەسەکان، یاخود پەیپێبردنیان لە لایەن خودی کەسەکەوە کارێکی گرنگو پێویستە بۆ سەرکەوتن، عەبدلعەزیز جادو دەڵێت: (بۆئەوەی لەو یاسایانە تێبگەین کە سەرکەوتنی کاری پێبەدیدەهێنرێت، پێویستە هەستێکی کەمت هەبێت بەرانبەر هێزی ناوەکیتو چۆنێتی ئاڕاستەکردنی لە ژیاندا).

**٢- دەرکردنی بڕیار:** هەریەك لە ئێمە دەتوانێت بڕیاربدات دەربارەی کار، یان خوێندن، یاخود چۆنێتی هەڵسوکەوتی لەگەڵ خزمان، یان دراوسێدا، هەمووان بە تەواوی ئازادن لە چۆنێتی دەرکردنی بڕیاردا، بەڵام دەرکردنی بڕیار مانای ئەوە نییە ئەو بڕیارە گونجاوە، یان نا، بڕیاردان، بریتی نییە لەو چرکە ساتەی کە بڕیاری تیادا دەردەکرێت.

- دەرکردنی بڕیار، واتا: توانای خودی، توانای کەشی کۆمەڵایەتی چواردەور لە: خێزانو کەسانی نزیك لە خاوەنی بڕیار، تەنانەت خەڵکانی نیشتەجێی هەمان شوێن دەگرێتەوە کە خاوەنی بڕیار تیادا نیشتەجێیە، ڕابردووی تایبەتی خاوەن بڕیار کە خۆی لە تاقیکردنەوەکانی ڕابردووی خاوەن بڕیارو ئارەزووەکانیو... لە تەواوکردنی بڕیاردا دەبینێتەوە.. تاد.

**٣- بەردەوامیو ڕازیبوون بە ئەنجامەکان:** بێگومان دەستپێکردن بەکارو بەردەوامیو لەئەستۆگرتنی ئەنجامەکان، قۆناغێکی قورسە، بیرۆکەی مەزن پێویستی بە کۆششی گەورەیە، ئەمە پێویستی بە هێنانەوەی بەڵگە نییە، بۆئەوەی لە ژیاندا سەرکەوین، پێویستە نەخشەمان لە ژیاندا هەبێتو کۆشش بکەین بۆ بەدیهێنانی هەندێك پێیان وایە کە قورسایی ژیانو ماندوێتی هەوڵو کۆششەکان دواجار پاشەکشەمان پێدەکەن بەرانبەر بە ئامانجەکان ئەمە بۆچونێکی هەڵەیە. چون ڕێکخستنی کارو دیاریکردنی ئامانجەکان کەشێك دەخوڵقێنن کە هەمووان پاش ماندوێتی هەست بە حەسانەوە بکەین (دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە).

چەندین هەنگاوی تر وەك وەرگرتنی ڕەخنەو تێبینیو شیکردنەوەیانو پەیوەستبوون بە ئامانجەکانەوە... هتد.

سەید سدیق عەبدولفەتاح زیاتر دەڕواتو لە پەرتوکەکەیدا « طريق الى السعادة فى الحياة»دا دەڵێت:

«سەرکەوتن تەنها عەبقەرییەت، یان بەخت نییە، بەڵکو دەوەستێتە سەر خۆئامادەکردنێکی ڕاست، نەخشەکێشانێك کە لە توانادا نەبێت تێکبشکێت»

سەرەڕای چەندین هەنگاوی تر وەك هەڵسەنگاندنی خود، لە هەرهەنگاوێکی کاردا دەنرێت، یان پەیوەستبوون بە ئامانجو مەبەستەکانەوەو... چەندانی تر.

### لەنیشانەکانی سەرکەوتن

- هەستکردن بە ئارامیو دڵنیایی.
- دابینکردنی لایەنی داراییو ئاتاج نەبوون بە کەسانی دیکە، چون لاسەنگبوونی لایەنی دارایی لە کاردا گەورەترین هۆکارە بۆ دروستکردنی خەمو ناڕەحەتی لە ژیانی مرۆڤەکانداو بیرتیژیو ئاسۆڕوونی مرۆڤ لێڵ دەکات.
- لە پێشچاوگرتنی ئامانجێکی خاوەن بەها لە ژیاندا، ئەو کەسەی تێدەکۆشێتو ئامانجێك لەبەرچاو دەگرێت بە حوکمی ژیان ڕێنمایی خۆیدەکاتو هەنگاو هەڵدەنێت، وەك ئەو کەشتییەوانە وایە کە دەزانێت ئاڕاستەی کەشتییەکە چۆن دیاری دەکات، تا دەیگەیەنێت بە مەنزڵ.



چاوپێکەوتنی: عومەر محەممەد سەعید
ئامادەکردن و وەرگێڕانی: سەروەر عومەر

# مەحموودی موعەززەمی، دامەزرێنەری «مەکتەبی کەمال» بۆ بڕیار دەدوێت..

**+ بۆچی هەندێك لە مرۆڤەکان، بێئەوەی هیچ شتێکیان لەبارەی سەرکەوتنەوە خوێندبێتەوە، لە ژیاندا سەرکەوتوون؟**

- لەبەرئەوەی سەرکەوتوویی‌و سەرکەوتن بە خوێندنەوە نییە، بەکارکردنە. ئەوەی ئێمە سەبارەت بە سەرکەوتن‌و زانستە مرۆڤایەتی‌و کۆمەڵایەتی‌و تەنانەت ئابورییەکان باسی دەکەین، لە خوێندنەوەی ژیانی مرۆڤەوە وەرگیراوە. لە ڕاستیدا ئەوانەمان بە لێکۆڵینەوە لەسەر ژیانی کەسانی سەرکەوتوو و ناسەرکەوتوو هەڵێنجاوە، نەوەك بەدیهێنان‌و داهێنان.

سەرکەوتن میکانیزمێکە هەموو مرۆڤەکان لەگەڵ خۆیاندا هەڵیدەگرن‌و خاوەنین. تەنها جیاوازی نێوان کەسانی سەرکەوتوو و ناسەرکەوتوو پێناسەی ئەوانە بۆ سەرکەوتن. کەسێك بە پێی پیلانێکی نەخشە بۆداڕێژراو، کەسێك دەکوژێت، لە کوشتنی کەسەکەدا «سەرکەوتوو» دەبێت. کەسێکی دیکە گیانی بریندارێك ڕزگار دەکات خۆی بە «سەرکەوتوو» دەزانێت. ئەوەی کەسی یەکەم ئەو کاتە پیاو کوژو کەسی دووەم بە پزیشکێکی بەڕێز میکانیزمی سەرکەوتن نییە، بەڵکو پێناسەی هەر یەکێکیانە بۆ سەرکەوتن. دزێك کە لەدەست پۆلیس هەڵدێت‌و پۆلیسێك کە دزێك دەستگیر دەکات، هەردووکیان سەرکەوتوون. ئەو پۆلیسەی ناتوانێت دزێك دەستگیر بکات‌و ئەو دزەی ناتوانێت هەڵبێت هەردووکیان خۆیان بە ناسەرکەوتوو دەزانن.

بە وتەیەکی سادەتر، «کەسانی سەرکەوتوو ئەوانەن کە بە هۆی پەروەردەی خێزان، یان مامۆستایان‌و پەروەردەکاران‌و دۆستانی بەڕێزەوە فێربوون، پێناسەیەکی دروستیان بۆ سەرکەوتن هەبێت‌و ئامانجگەلی بەهاداریان بۆخۆیان دیاریکردووە.»

**+ ئایا بەختەوەری شتێکە لە ژیانی مرۆڤەکاندا ونبووەو دەبێت بە دوایدا بگەڕێین؟**

- بە داخەوە ژیانی مرۆڤ پڕە لە ئەزموونی شکستخواردو بۆ گەیشتن بە بەختەوەری، خۆشبەختانە کەم نەبوون ئەو کەسانەشی ڕێگەی بەختەوەری‌و خۆشبەختییان دۆزیوەتەوەو بە ئێمەیان ناساندووە.

ئێمە لەو باوەڕەداین یەکێك لە هۆکارە گەورەکانی نابەختەوەری مرۆڤ، ئەوەیە کە پێناسەیەکی دروستمان بۆی نییە. چۆن دەتوانین دەستمان بە شتێك بگات کە نایناسین‌و نیشانەیەکمان لەبارەیەوە لەبەردەستدا نییە؟ زۆربەی خەڵکی «سەرکەوتن»یان، لەگەڵ «خۆشبەختی»دا لێتێك دەچێ‌و ڕەنگە هەربەم هۆیەشەوە بێت کە مرۆڤەکان بەردەوام بە شوێن سەرکەوتنە یەکلەدوای یەکەکانەوەن، واتە گەڕان بۆ «بەختەوەری» لە دەرەوەی خۆی.

ئەزموون نیشانمان دەدات ئەم ئارەزووە تێر نەبووەی مرۆڤایەتی بۆ سەرکەوتن لەبەرئەوەیە کە لەدوای هەر سەرکەوتنێك «هەستێکی خۆش» توشی کەسی سەرکەوتوو دەبێت، ئەم هەستە بە ڕادەیەك شیرین‌و وزەبەخشە بۆ بەدەستهێنانی دووبارە خۆی ناچار بە دەستخستنی سەرکەوتنێکی گەورەترو زیاتر دەکات. ئەم هەستە بەهادارە کە هەمان «هەستی بەختەوەری»یە، لە تێڕوانینی منەوە بەو هۆیەوە لە کەسی سەرکەوتوودا ڕوودەدات کە تەنها لەو ساتەدا دەتوانێت «خۆی خۆشبوێت‌و ڕێز لە خۆی بگرێت.»

پێناسەی ئێمە بۆ بەختەوەری زۆر سادەو حازربەدەستە، «بەختەوەری هەستێکە تەنها بە قبوڵکردن، خۆشویستن‌و ڕێزگرتنی خودەوە دێتە دی».

کەواتە هەر کاتێك هەر کەس لە ئێمە بتوانێت، هەر بەوجۆرەی کە هەیە خۆی قبوڵ بێت، خۆی خۆشبوێت‌و ڕێز لە خۆی بگرێت، خۆی بەختەوەر دەکات. ئەم بارودۆخە دەکرێت بۆ هەر کەسێك‌و لەهەر پلەو پایەیەکدا بێت ڕووبدات. هەر لەبەرئەوەیە کە ناسراوو کەسە دیارەکانی ئێمە چەندین جار ئاماژەیان بەم خاڵە کردووە، کە بەختەوەری‌و خۆشبەختی کارێکی دەروونییەو دۆزینەوەی لە دەرەوە مومکین نییە».

ئاو لە گۆزەدایەو ئێمە بە تینوێتی دەگەڕێین، یار لە ماڵەوەیەو ئێمە چواردەوری جیهان دەگەڕێین.

یان ساڵانێك دڵ داوای جامی جەمی لە ئێمە دەکرد، ئەوەی کە خۆی هەیبوو لە بێگانەی داوا دەکرد.

بەڵام دیارییان نەکردووە ئەم هەستە نامۆو جوانە دەروونییە، چۆن بەدیدێت، یان ڕەنگە من لە وتەکانیان تێنەگەیشتبم.

هەرچەندە لەسەرەتاوە دەکرێت ئەم وێنایە بێتە پێشەوە، خۆشویستنی خود یەکسانە بە خۆپەرستی، شەیدابوونی خودو نامۆ بوون بە مرۆڤەکان، بەڵام هەر کەس کە ئەم ڕاهێنانە ئەنجام بدات بە زوویی تێدەگات تەواوی ئەم خەسڵەتە ناپەسەندانە لە خۆشنەویستن‌و متمانە بەخۆنەبوونەوە سەرچاوە دەگرن، تا خۆشویستن‌و ڕێزگرتنی خود.

**+ ئایا دەتوانین فێری ڕێگەکانی سەرکەوتن ببین؟**

- هەمووان بەجۆرێك سەرکەوتووین. بۆ نموونە، زیندوومانەوە خۆی گەورەترین سەرکەوتنی مرۆڤایەتییە. سەرکەوتنێك کە هەر چرکەساتێکی لە گرەوی ملیۆنان چالاکی بایۆکیمیایی ئاڵۆزو سەرسووڕهێنەردایە. ئەوەی دەتوانین فێری بین بەکارهێنانی ئەم میکانیزمەیە لەبەرژەوەندی خۆمان‌و ئەوانی دیکەدا. کە یەکەمین هەنگاوی فێربوونی «ئامانج»دانانە. کاتێك فێر ببین چۆن بە ئامانج دانانی دروست میکانیزمی سەرکەوتنی خۆمان بێدارو چالاك بکەین‌و ڕاهێنانی لەسەر بکەین، بارودۆخێکی تازەو سەرسووڕهێنەر بەناوی «خوگرتن بە سەرکەوتن» لە ئێمەدا بەدیدێت. واتە ئەم باوەڕ بەخۆبوونە لە ئێمەدا دێتەدی کە بە تەواوەتی تەسلیمی هەلومەرجەکان ببین. ئەوکاتەیە کە

«چەرخەکـە هەڵئەگێڕینــەوە، ئەگــەر بــە پێچەوانەی ئامانجی ئێمەوە بخولێتەوە.»

**+ زۆرێـك لـە مرۆڤـە مەزنــەکان لە مەینەتیو نەداریدا ژیاون، ئایا ئەوان ڕێگەکانی بەختەوەریو خۆشبەختییان نەزانیوە؟**

- پرسیارێکی هۆشیارانەیە، لێکۆڵینەوەکان نیشـانی دەدەن کەسـە زۆر سـەرکەوتووەکانی جیهان لە چەند شتێکدا لەیەکدەچن:

بەرلە سەرکەوتنە گەورەکانیان، جارێك، یان چەندجارێك شکسـتێکی تـاڵ و دژواریان هەبووە، یان زۆربەی سەرکەوتنەکانی خۆیان، دوای چل ساڵی بەدەست هێناوە.. هتد.

ئەمــە تەنها لەبەرئــەوە نەبووە ئەوان ڕێگەکانــی بەختــەوەریو خۆشـبەختییان نەزانیــوە، بەڵکــو دەکرێت لەبــەر ئەم هۆیە بێت کە پاڵنەری پێویسـتیان بۆ سـەرکەوتنو چارەسەری کێشەکانی خۆیان نەبووە. ئەگەرنا میکانیزمی سەرکەوتن لەواندا وەك مرۆڤەکانی دیکە بووە کە پێویسـتی بــە بێدار بوونەوەو بەرنامەدانــان هەبــووە. ئــەو سـەختییانەی لەگەڵیــدا ڕووبــەڕوو دەبنــەوە دەبێتە هۆی ئــەوەی بگەنــە باوەڕبەخۆبــوونو پاڵنــەری پێویسـت بۆ جووڵــە لە خۆیانــدا بدۆزنەوە. تەنهــا مەرجی ئەم قۆناغە لە سـەختییەکان ئەمەیــە کــە بتوانن بــەردەوام بــنو لێیەوە فێربن. نیچەش دەڵێت: «ئەوشتەی نەمکوژێت بەهێزتــرم دەکات.» کەواتە لە سـەختییەکان نەترسـینو ئەوان بــە دەرفەتێـك بزانین تا هێزە شاراوەکان لە بوونماندا بێدار بکەینەوەو بە بەرنامەدانانو ئامانج دیاریکردنی دروست، دەسـتمان بەو بارودۆخە باشـترە ڕابگات کە شایستەی ئەوین.

ڕەنگە هەر بەم هۆیەوە بێت کە دەڵێن: مەزنــی مرۆڤەکان لە هەلومەرجی سـەختو دژواردا دەردەکەوێـت. هەمووومــان تۆوێکــی مەزنی لە ناخماندا هەیە، تەنها هێندە بەسـە بیدۆزینــەوەو پەروەردەی بکەین. خۆشـنودی لــە هەلومەرجی ئاسـاییو خۆشـیدا کارێکە لە توانای هەموو کەسـێکدایە، هونەر ئەوەیە لــە هەلومەرجــی ســەختو دژواردا بتوانین ســەنگینیو ئارامگــری خۆمــان بپارێزیــنو بــەردەوام بیــن تا بــە ئامانجەکانــی خۆمان دەگەیــن. ئــەو بابەتــە سەرنجڕاکێشــەی لە «مەکتەبی کەمــاڵ»دا باس دەکرێت جێگەی خۆیەتی لێرەدا بوترێت.

ئێوە چەندە چێژ لە خواردن وەردەگرن؟ چەندە چێژ لــە خواردنەوەی ئاو وەردەگرن؟ چەندە چێژ لە خەوتن وەردەگرن؟

سەرنجڕاکێشە بزانن بڕی ئەو چێژەی لەو بوارانەی سـەرەوە وەریدەگــرن، هەرگیز پەیوەندی بە بڕی خواردن، یان ئاو، یان کاتی خەوتنی ئێوەوە نییە! چێژی زۆرتر پەیوەندی بــەوەوە هەیــە چەنــدە برسـیتە، چەنــدە تینووتــەو چەندێك ماندوویتو خەوت دێت؟ لە کاتێکدا ئێمە وەك مرۆڤ بۆ دەستخسـتنی چێــژو ئارامی زیاتر بە شـوێن خواردن، ئاوو خواردنــەوە دایــن، بێئــاگا لــەوەی چێــژ لە برسـێتیو تینوێتــیو ماندوێتیدایــە. ئەمانە بەهــان، ئەو بەهایانەی ئێمە بە کردەوە لێیان هەڵدێین. کێشەو گرفتەکانی ژیان دەرفەتگەلی زێڕینن، کە مرۆڤگەلی جاویدانو لە یادنەچوو دروسـت دەکەن، دەرفەتگەلێك هەن تواناکانی ئێمــە نیشـانی ئێمــە دەدەنــەوەو بەداخەوە ئێمــە لــە کێشــەکان هەڵدێیــنو بەهەڵە لە ڕووبەڕووبوونەوەیان دەترسین.

**+ دەڵێن ئەگەر غەم نەبێت، شادی هیچ مانایەکی نییە، ئایا دەتوانین دونیایەك بەبێ ئەشكو غەمو حەسرەت وێنا بکەین؟**

- زەینــی مرۆڤ بــە جۆرێکــە تەنها لــە جیاوازییەکان تێدەگاتو خۆشــیو خەمی ڕەها بەلایەوە مایەی تێگەیشـتن نییە. ئەگەر نوکتەیەکمان بۆ بگێڕنەوەو پێبکەنین، بۆ جاری دووەم دەبێت نوکتەیەکی خۆشتر بگێڕنەوە تا بە هەمان ئەندازە پێکەنینمان بێت. سەبارەت بە غەمو کێشەکانی ژیانیش هەر بەوجۆرەیە. باشــترە لە جیاتــی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هــەر کێشــەیەکدا سـەرەتا قبوڵــی بکەیــن. (لێرەدا قبوڵکردن بــە مانای کۆکبوون نییە.) پێشنیاز دەکەم هەربەوجۆرەی نیچە وتویەتی ڕەفتــار بکەین: «تا دەتوانن بەدوای خۆشــیو شــادییدا بگەڕێن، غەمو خەفەتــەکان خۆیان ئەماندۆزنەوە.» سـەرنج بدەن مرۆڤ بە دوو ڕێگە دڵخۆش دەبێت:

١- زۆربوونــی خۆشــی، یــان خۆشــی زیاتر.٢ - کەمبوونەوەی ناخۆشییەکان.

لــەم سیسـتەمەدا هەربەوجــۆرەی کــە دەیبینن هەم غەمو پەژارەو هەم تەنگانەکانو هەم دەرفەتــەکانو ســەرکەوتنەکان دەتوانن ببنــە هــۆی شــادومانی ئێمــەو ســڕینەوەی هەریەکێکیــان ئۆتۆماتیکــی دەبێتــە هــۆی کەمبوونەوەی شــادومانیو لە خۆڕازیبوون لە ژیانماندا.

**+ کەمێك سەبارەت بە بەربەستەکانی سەر ڕێگەی سەرکەوتن قسەمان بۆ بکە، بۆچی زۆربەی ئەم بەربەسـتانە بەرهەمی دەسـتی خودی ئێمەی مرۆڤەکانە؟**

لــە «مەکتەبــی کەمــاڵ»دا ئێمــە لەوباوەڕەداین، بەربەسـت ئەنجامی جووڵەیە. واتــە ئەگەر کەسـێك نەجووڵێــتو ئامانجی نەبێت، تووشــی بەربەرسـت نابێت. خاڵێکی دیکە ئەوەیە تا بەربەستو کێشەیەك چارەسەر نەکەینو لەسەر ڕێگە لای نەبەین، شتێك فێر نابیــنو گەشــە ناکەین. هەر بەوجــۆرەی لە بەشــی ئامانجدا وترا، جووڵە ســەرچاوەی لە ئامانج دانانەوە گرتــووەو تاکاتێك ئامانجێك بۆخۆمان دانەنێیــن، جووڵەیەك بەدینایەتو ژیانی بێئامانج بە وتەی مەولانا یەکســانە بە مــەرگ. هەموو ژیان ئەوەیە کە بە خامۆشــی نەمریت.

**+ ئێــوە لــە ڕۆژئــاوا وانــە دەڵێنەوە، مرۆڤەکانی ڕۆژئـاوا لە مرۆڤەکانی ڕۆژهەڵات سـەرکەوتووترن لـە ژیانـدا، بـەڵام لـەوێ بەختەوەریو خۆشبەختی کەمترە. لەگەڵ ئەم وتەیەدا هاوڕان؟**

- نازانــم ئەم وێنــا هەڵەیــە لەکوێوە هاتووە؟ بۆ تێگەیشتن لە ڕەفتارەکانی خەڵکانی ڕۆژئاوا، دەبێت ئامــڕازی جیاوازترمان هەبێت لەوەی ئێسـتا هەمانە. هەروەهــا ئەوانیش بۆ تێگەیشــتن لــە بارودۆخی ڕۆژهــەڵات دەبێت دەستیان بە لێهاتووییەکانی ژیانی تازە ڕابگات. خەڵکانی بەختەوەرو خۆشبەختو ناخۆشبەخت لە هەمــوو جێگەیەکی جیهاندا هەن. خەڵکانی ڕۆژئاوا خۆشگوزەرانترن، نەوەك بەختەوەرتر. بەختــەوەریو خۆشــبەختی بــە تێڕوانینــی مــن، کاتێك لە پێداویسـتییە سـەرەتاییەکانی مــرۆڤ بگوزەرێیــن، وەك خــواردنو دڵنیاییو تەندروسـتیو... هتــد، زیاتــر هەڵبژاردنێکــە تــا ڕووداوێــك لــە دەرەوەی بوونــی ئێمە. بە گوزارەیەکی دیکــە ڕۆژئاواییــەکان توانیویانە لە ژێر سـایەی گەشەسەندنی عەقڵدا، زانستو کرداری خۆی لە بەندی ئەو کێشە سەرەتاییانە ڕزگار بــکات کــە ئێمــەی ڕۆژهەڵاتی هێشـتا لەگەڵیــدا دەسـتەویەخەین. خەڵکانــی ئەوێ کێشــەی خۆیــان هەیە، بەڵام کێشــەگەلێك لە ئاسـتێکی باڵاتــردا. بۆ نموونە ئەو کێشـانەی منداڵێك لــە بەرامبەر گەورەیەکــدا هەیەتی. لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان لە ژیاندا کێشـەیان هەیە، بەڵام سروشتی کێشەکانیان زۆر جیاوازە لــە یەك. کێشــەکانی منداڵ گــەورە دەتوانێت چارەسەری بکات، بەڵام کێشەی کەسانی گەورە، منداڵ تەنانەت ناتوانێت لێشی تێبگات، چ بگات بەوەی چارەسەری بکات. (هەرچەندە هەندێجار ڕوودەدات گەورەکان لەبەر سـەرقاڵی زۆر گوێ بە کێشــەی منداڵەکان نــەدەنو بێتوانا بن لە ئاستیدا). ڕۆژهەڵاتییەکان خاوەنی ئەو کەراماتو بەهایانەن کە ئاسـایی بە هۆی هەستکردن بە کەمیو پەروەردەی نادروسـتی خود، بە باشـی پەییــان پێنەبردووەو لێی بەئــاگا نینو تەنها کاتێك کە لێکۆڵەرێکی ئارەزوومەندی ڕۆژئاوایی ئــەم بەهایانە دەدۆزێتەوەو دەیناسـێنێت پەی بــە بەهاکەی دەبــەن. وەك کەسـایەتییەکانی کوروشــی مــەزن، مەولانــا، حافــز، یاخــود شــوێنەوارە دێرینەکان، یان سـامانەکانی ژێر زەویو کانزاکان. ئەمانە کاتێك دەکەونە سـەر زاران کــە گەورەییو مەزنی ئــەوان لە ڕێگەی هونەرمەنــدانو لێکۆڵەرانــی ڕۆژئاواییــەوە بدۆزرێنەوەو تەرح بکرێن. من ڕۆژهەڵاتییەکو ئێرانییەکــم، ڕابردوو، ئێسـتای خــۆمو وڵاتو نەتەوەکەم قبوڵەو لە جێگەی دروسـتی خۆیدا ڕێزیان لێدەگرم، بــەڵام خاکییانە دەبێت دانی پیابنێم زۆر شـت هەیە دەبێـت لەوانەوە فێر بـم، زۆر شـت. یەکێك لە سـەرەکیترینی ئەو شـتانە کــە «مەکتەبــی کەمــاڵ» لــە هەوڵی برەوپێدانیدایــە، « فراوانکردنــی ڕێزگرتن لە خودو خۆشویستنی خودە».

و: بۆ کوردی: پشتیوان موبارەك

# حەوت ڕەفتار کە زۆرترین کاریگەرییان لەسەر خەڵك هەیە




لە پرفرۆشترین کتێبەکانی ئەمریکا، لە بەناوبانگترین کەسە دیارەکانی ئەمریکا لە دنیای بزنسمانەکان بۆ ماوەی ١٥ساڵی بەردەوام، ستیڤن کوفی ئەم تیۆرەی لە حەوت هەنگاو، یان ڕەفتاردا پێشکەش دەکات، بۆ هەموو کەسێك کە دەیەوێت سەرکەوتوو بێت لە کارەکانیدا..

* کتێبەکە باسی حەوت ڕەفتار دەکات، سێ ڕەفتاری یەکەم هەڵسوکەوت لەگەڵ خودو گەشەپێدانی کەسێتی لەخۆ گرتووە، بەڵام سێ ڕەفتارەکەی تر باسی هەڵسوکەوت دەکات لەگەڵ کۆمەڵگاداو بەرجەستەکردنی خۆت زیاتر لە ڕێگای گروپو پەیوەندیو یارمەتییەوە دەبێت، بەڵام ڕەفتاری حەوتەمو کۆتایی باسی نوێبوونەوەیە، بۆئەوەی ببیتە باشتر لەوەی کە ئێستا هەیت، هەوڵ بدە دووبارە خۆت سازبدەیتەوە..

**سەرکەوتن لە ژیاندا:**

**ڕەفتاری یەکەم: کارا بە (چالاك بە):**

وەك نوسەر دەڵێت: ئەمە ڕەفتاری یەکەمە، ئەم ڕەفتارە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە کارلێکی تۆ لەگەڵ خەڵکیدا لە خۆتەوە سەرچاوە دەگرێت، لە بڕیارەکانتەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام لەسەر بارودۆخ بنیاد نەنراوە، پێویستە بزانیت کە سەرکەوتووەکان، ئەوانەن کە بە پێی بڕیارەکانیان کاریان کردووەو لەگەڵ بارودۆخدا هەڵسوکەوتیان کردووە، نەك بە پێی کاردانەوەیان بەرامبەر بارودۆخە یەك لە دوای یەکەکان کە بەسەریاندا هاتووە. هەرگیز لۆمەی بارودۆخ مەکەو بڵێی: چی بکەم؟!! ئەمە بارودۆخەکەیە، ناتوانم لەمە زیاتر بکەمو زیاترم لە دەست نایەت، بەڵکو بارودۆخ دەسەڵاتی هەیە بەسەرمداو بڕیارم بەسەردا دەداتو بارودۆخ ڕێگەم لێدەگرێت..

پێویستە بزانیت: تۆیت دەڵێیت: (چۆن وەڵامی ئەو کەسە بدەمەوە؟) بێزارکەر دەبم، بەختەوەر دەبم...».

تۆ خۆت دەسەڵاتت هەیە بەسەر ژیانتداو بڕیار دەدەیت نەك کەسێکی تر، ئەگەر پێویست بێت بزانیت گرنگترین شت لە ژیاندا چۆنییەتی وەڵامدانەوەکانمانە، بەرامبەر بەوەی کە لە ژیانماندا ڕوودەدات..

مەڵێ بارودۆخەکە لە سەرم قورسو گرانە، بەڵکو هەوڵ بدە ئەو کێشەیە چارەسەر بکەیتو بزانە کەمو کورتییەکە لە کوێدایە، لە کوێوە دەست دەکەیت بە چارەسەری کێشەکە، نائومێد مەبەو هەوڵ مەدە گۆڕەپانی خۆت بۆ کەس جێبهێڵیت، هەوڵ مەدە واز لە پێگەو شوێنی خۆت بهێنیت..

پێویستە بزانیت کە تێکەڵ بوونت لەگەڵ خەڵکی، یان چالاکییەکانت پشت بە تۆ دەبەستنو بە تایبەتی ئەو زمانی ئاخاوتنەی کە لە ناختدا دەسوڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ کاریگەرییەکەی نازانیت لە سەرت، ئایا بیرت کردووەتەوە چۆن ئەم وشانە بەخۆت دەڵێیت؟

* من ئاوام. واتە ناتوانیت بگۆڕێیت..

*ئەو شتە، یان ئەو کەسە توڕەم دەکات، یان مەزاجم تێکدەدات.

تۆ هەوڵدەدەیت هەستەکانتو ئەوەش لەناختایە بیکەیت بە کەسێك، یان شتێکی تر.. تۆ هەوڵدەدەیت خۆت پەیوەست بکەیت بە شتێکی ترەوە... خۆت لەو شتە ڕزگار بکە، ئەو کات خۆت لە بارودۆخێکی باشتردا دەبینیتەوە...

* پێویستە ئەوە بکەم، ئەمەش مانای وایە تۆ هەوڵ دەدەیت ئەو کارە بکەیت، لەبەرئەوەی ناچارکراویت، بەڵام ئەنجامی نادەیت لەبەرئەوەی خۆشتدەوێت..

هەر یەکێك لە ئێمە هەوڵدەدات خۆی چالاك بکات، واتە کاریگەر بێت بە ڕێگایەکی باشتر لەوەی دەوروبەریی، بەڵام بۆئەوەی چالاك بێت پێویستە ئەو بازنەیە فراوان بکەیت کە کاری تێدادەکەیت..

دەتوانیت ئەمەش بە ئاسانترین شێوە جێبەجێ بکەیت، بە (چالاکی گۆڕان)، نمونەیەکی ڕاهێنان.

هەوڵبدە چەند بەڵێنێکی بچووك بدەیت بە هاوڕێکانت، یان کەسێك کە خۆشت دەوێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەوڵبدەیت پابەند بیت بەو بەڵێنانەوە، هەوڵبدە گرنگی بدەیت بە جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانەو نیاز پاکیت تیایدا...

(کاری گۆڕان) ئەم وشانە بگۆڕە: ئاە. ئەگەر ئەوەی دەمویست ڕوویبدایە چۆن بتوانم سوود وەربگرم لەوەی ڕوویداوە لێمەو ڕوودەدات، چۆن لە بەرژەوەندی خۆم بیگۆڕم؟» بەم شێوەیە دەتوانیت کاریگەر بیتو لە دژی کۆسپو تەگەرەکان بووەستیت، بەڵکو دەتوانیت کۆسپەکانی سەرڕێت کەساس کەیت.

هەروەها دەتوانیت بە وریاییەوە گوێ لە هاوڕێکەت بگریت، کاتێك قسە دەکات، کاتێك قسەت بۆ دەکات سەیری لایەکی تر مەکە، هەوڵبدە بە شێوەیەکی باش گوێبیستی وتەکانی بیت، هاوڕێکەت گرنگیت پێدەدات، لەبەرئەوەی تۆگرنگیت پێدا، هەروەها کاریگەر دەبیت لەسەریو بە شێوەیەکی تر بازنەی کاریگەریت زیاد دەکات.

هەوڵ مەدە دادوەر، یان ڕەخنەگربیت، لەوەی لە بەردەمتدا ڕوودەدات، بەڵکو لایەنێك بە، لە چارەسەری کێشەکەدا، بەڵام لایەنێك مەبە لە قورسکردنی کێشەکە، هەوڵ بدە سەیری خەڵکی تر بکەیت، کاتێك کە هەڵە دەکەن، چونکە تۆش جارێك هەڵە دەکەیتو دەچیتە شوێنی ئەوان، هەوڵمەدە گفتووگۆی خاڵە لاوازەکانی کەسی بەرامبەرت بکەیت، بەڵکو هەوڵ بدە لەو خاڵە لاوازانە دوور بکەوەرەوە، چی ڕوودەدات ئەگەر هەڵەت کرد؟ نیگەران مەبە، بەڵکو پۆزش بێنەرەوە لەوەی لە دەستت ڕوویداوە، هەوڵبدە ئەوەی لە ناختدا ڕوودەدات، فەرامۆشی بکە، زیاتر لەوەش قۆناغی خۆبەزلزانینو پۆزش هێنانەوە تێپەڕێنە، زۆرشت دەگۆڕێت.

# ئێوە دەبێت لە شوێنی ئەوان هاوار بکەن!

سپێدە هورمزیار

ژیـــان لەو مــاڵو لانەیــە دەچێت کە مرۆڤــەکان لــە نێویــدا پارێــزگاری لــە بوونییــەتو ژیانی خۆیــان دەکەن. بەڵام خاڵــی جیاوازی نێوان ژیــانو ماڵەکانتان، ئەوەیە کە ژیان بێ ســەقفەو گوزەراندنی ڕۆژەکان تێیدا بە خۆشکەیفیو بەرگریکردن لە هەمان دۆخدا ئەستەمە.

مەگــەر تەنهــا ئەوە نەبێت کە گشــت لایەك لــە هەوڵی دروســتکردنی ســاباتی ژیانــی خۆتان بن، هەڵبەتە بــۆ بنیادنانی ساباتەکانتان پێویســتان بە هاوکاریکردنی هێزی ناختان دەبێت، بۆئەوەی لە دواجاردا بتوانن بڕیاری بە کەڵك بدەن، پێش ئەوەی کــە هەنــگاو هەڵگــرنو بڕیــاری یەکلایی کــەرەوەی خۆتــان بدەن، ڕەنگــە گەر لەم وتەیە تەرکیزبکەنو چەند خولەکێك کاتی خۆتانــی بۆ تێڕامان پێبدەن، ســوودی زۆر وەدەســتبخەن، کە دەڵێت: ئەگەر بە ڕاستی براکەمــان هاوارکردنی نییە، ئەوە ئێمەین کە دەبێت ئەم کارەی بۆ ئەنجام بدەین.

ئەمە هەمان پێوەرە کە گرنگە لە ژیانی کۆمەڵایەتیتان خۆی وێنا بکات، واتا دەبێت ئێوە زەحمەت بکێشــنو ببن بە دەست بۆ ئەو کەسانەی کە خوداگیان لەم دیارییەی پێنەداونو دەبێت بە دەســتەکانی خۆتان، نیگاری جوانییەکانی ژیانیان بۆ بکێشــن، ببن بە ڕۆشنایی چاو بۆ ئەوانەی ئیتر بۆ هەمیشە تارمایی میوانیانە. هەرچەندێك ئێوە لــە پلەی بــەرزی زانابیدابن، زاناتر لە ئێوە لــە لوتکەی بەرزتر بوونی هەیە، هەرچەنــدە گــەر لە هەنــدێ لایەنەکانی ژیــان نەزانیش بــن، نەزانتریش لە ئێوە بوونیــان هەیــە، بــەم پێــوەرەش گشــت لایەکتــان بە ڕادەی تەمەنو هۆشــمەندی خۆتــان ئەزموونتان هەیە، گــەرواش بێ ڕێگــە بدەنو قبوڵی بکــەن ئەوانی تر لە ئەزموونی ئێوە شتێك فێربن.

چونکە بەم کارەتان نەوەك هەر تەنها خزمەت بە هەستی ئارامی خۆتان دەکەن، بەڵکــو دەبــن بــە داهێنــەری بنیادنانی پەیژەیــەك کــە ڕێگــری دەکات لافــاوی ئازارچەشتنو شکستو خۆشەویستانتان بە خنکان بەرێت.

مەبەستەکە ڕوونە کە ئێوە دەبێت بە ڕێژەی ئەزمــوونو تواناکانتــان ڕێنمایی ئەوانــی تربکــەن. لــە پێناو ئــەوەی کە دۆســتانتان نەکەونــە نێو چاڵی شــوومی ڕۆژە ســەختەکان. بەڵام ڕەفتارێکی جوان نییــە کە هەر لە خۆتانەوە دەســت بکەن بــە ئامــۆژگاری کەســی مەبەســتدار بە بێ ویســتی ئــەوان، ئەزموونی شکســتو ســەرکەوتنەکانتان بــدەن بــە گوێیاندا، چونکــە ئەمە ئــەوە دەگەیەنێت کە ئێوە گەورەیی خۆتان دەســەپێنن بەسەریانداو لە هەمــان کاتــدا زیاتر بچووکــی ئەوان دەســەلمێنن، بۆیــە لە دواجــاردا حەزی بیستنی ئەوان بۆ گوێگرتن لە ئێوە کەمتر دەبێتو ئێوە ناگەن بە مەبەستی دڵخوازی خۆتــان، کــە پارێزگاریکردنــی ئەوانە لە شکســت، بەڵکو خۆتان بەم کارەتان شکست بە خۆتان دەهێنن.

بۆیــە هەرچەندێــك لــە تواناتاندایە لــە نواندنی وەهــا ڕەفتارێــك خۆتان بە دووربگــرن. گەر بانگی نیــوەڕۆ، یان هەر کاتێکــی تــری فەرمــوو، گــەر هــەر ئەو کات هەڵنەســان بــە ئەنجامدانــی ئەرکی سەرشانتان، کە نوێژکردنە، ئیتر لە کاتێکی تردا نوێژکردن هیچ کەڵکێکی نابێت.

ڕێنمایی کردنی دەوروبەریش هەروایە، هەندێــك کات پێویســتە ئــەوان ڕێنمایی وەربگرن، گەرخۆیان داواکارییان پێشکەش نەکرد، پێویســتە خۆتان دەستپێشــخەری بکەن. بــەڵام ئاگاداربن خۆتان وێنا نەکەن بــە کەســانێکی گەورەو لێــزانو ئەوانیش بــە بچووكو کەم بایەخ، ئەگەر ئێســتا لە بیری ئەوەدان کە چۆن چۆنی هاوڕێیانتان لــە کەناری ژیان شــەپۆلی بــێ ئاگایی بە خنکانیان نەباتو ئارەزوو دەکەن کەشــتی ئەزموونــی ئێوە لە دواجــاردا بە فریایان بکەوێتو بۆ هەمیشە ڕزگارییان بکات، ئەوا بە چەشــنی باوکی یوســف مامەڵە بکەن، ئەها ئەو کاتەی ((یوســف سەلامی خودای لێبێــت))، خەوەکەی لای باوکی باســکرد، بێئەوەی یوسف داوای ئامۆژگاری لە باوکی بکات، بڵێت: ئێستا من دەبێت چی بکەم؟

(یەعقوب سەلامی خودای لەسەر بێت) بێ دوودڵی وتــی: خەوەکەت لای براکانت باس مەکە. باوکە داناکەی یوسف نەیگووت من لــە ڕاڤەکردنی خــەودا لێهاتووم. من باوکــی تــۆم، دەبێت گوێڕایەڵــم بیت. تۆ منداڵی هیچ نازانیت. من دەیزانم.

دەشــێ دەوروبەر پەی بــەوە نەبەن، کــە لــە دواوەی ئــەوان دڕندەی شکســت بــە ڕێگاوەیــە بۆیان، بەڵکــو دەبێت ئێوە بــە چاوەکانتــان ئەم دێوەزمانــە ببیننو ئەوانی دی ئاگاداربکەنەوە. بەڵام شــانازی بەوەوە مەکەن کــە چاوەکانتان دەتوانێت ئاگاداربێت، بە هاتنی شووم نشوست، کەچی ئەوان توانای وەها بینینێکیان نییە.

دیمەن حەیدەر

# درەنگ، یان زوو گەیشتن!

کەسمان بێ ئاوات ناژین، هەموو کەس ئاوات بۆ ژیانێکی باشتر دەخوازێت. جا درەنگ بێت، یان زوو، لێرە بێت، یان لەوێ، پەلەکردن لە زوو بەدیهاتنی ئاواتەکان، سیفاتو سروشتی مرۆڤەکانە، ئۆقرەنەگرتن لە چاوەڕوانییەکانداو هەمیشە ویستی زوو گەیشتن بە مەبەستو درکپێنەکردنو نەبینینی حیکمەتی خودایی لە دواکەوتنو بەدینەهاتنی ئاواتەکان، دیسان سروشتی زۆربەی مرۆڤەکانە.

ڕەنگە هۆکاری نیگەرانیو پەلەکردنەکانی، هەر ئەو نادادپەروەرییانە بێت لە نێوان مرۆڤەکاندا، کە لە بەرامبەر دەسکەوتەکانی ژیاندا هەیە، مرۆڤێك دەبینێت هاوشانو هاوتەمەنەکەی کارو ژیانێکی گونجاوو باشی بۆ ڕەخساوە، کەچی ئەم بێبەشە لەو دەسکەوتانە. هەرچەندیش هەوڵی زیاتر لە هاوشانەکەی دابێت، بۆ گەیشتنی بە هەمان ئەو مەبەستانەو لەو ڕێیەدا، ماندووبوونو دڵسۆزی زیاتریشی نواندبێت.

ئەم جۆرە لێکدانەوەیەو خەمڵێخواردنی، بۆ کەسێك کە دوور بێت لە ناسینی پەروەردگارو لە هۆی بوونمان لەم ژیانەدا بێخەبەر بێت، لێکدانەوەیەکی ئاساییو ڕاستە، چونکە شتەکان لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەونو دەبینرێن، بەڵام بۆ کەسێکی هۆشیارو باوەڕدار، کە بەدیهێنەرەکەی بە باشی ناسی بێتو نزیك بێت لێیەوە، ڕاست نییەو بەڵکو بیرکردنەوەیەکی زۆر جیاوازتری دەبێت، چونکە بێگومانە لەوەی کە:-

* ئەم دونیایە ئەگەر بمانەوێت هەموو یەکسان بن لە کاروبارو بەڕێوەبردنی ژیاندا، ئەوا پێویستی بە بوونی ئەو دونیاو لێپرسینەوەش نەدەکرد. ئەو کات بوونمان لەم دونیایەدا پووچو هەڕەمەکیو بێمانا دەردەچوو.

* هەروەها بە لای ئەو مرۆڤەی کە لە ڕاستی بوونی ئەم ژیانە گەیشتووە، گەیشتن بە ئاواتەکانو مەبەستەکان لە بەڕێوەبردنی ژیاندا، تەنها وەسیلەیەکی کاتین، بۆ بەسەربردنو تاقیکردنەوەمان تێیاندا، چونکە ماڵی ئەبەدیو حەوانەوەمان ئێرە نییەو هەموومان بە گەشتێك تێیدا میوانین.

* ئەوەشی لا ڕوونە کە کەس لە حیکمەتی خودایی ئاگادار نییەو توانای ئێمە سنووردارە، بۆ زانینی حیکمەتو کارەکانی بەدیهێنەرەکەمان. بۆیە ئەگەر هەستی بەوەکرد کە لە تەك هاوشانەکەیدا یەکسان نییەو بێبەشە لە دەسکەوتە دونیاییەکان، پێی دڵگران نابێتو لە جێی ئەوە ئارامگریو پاڕانەوە، لە بارەگای خودا هەڵدەبژێرێت، چونکە بەو ناسینەی کە ئەو لەبارەی بەدیهێنەرەکەی هەیەتی، دەزانێت بێ هۆ نییەو ڕەنگە گەیشتنی بە پلەوپایە باڵاکان، ئەگەر بۆ هاوشانەکەی خێری تێدا بێت، بۆ ئەم بەجۆرێکی تر بێت، چونکە هەروەك گوتمان، مرۆڤ توانای دەرککردن بە حیکمەتەکانی پەروەردگاری نییەو لە ئاست زانینی(غەیب)دا دەستەوەستانە، هەروەك خودای گەورە پێمان دەفەرموێت: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًۭٔا وَهُوَ خَيْرٌۭ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًۭٔا وَهُوَ شَرٌّۭ لَّكُمْ﴾.

* هەروەها مەرج نییە مرۆڤی خوداناس، هەمیشە لە دەسکەوتو خۆشییە دونیاییەکان بێبەش بێت، بەڵکو گەیشتنی بەو مەبەستانە، لەسەر درەنگ، یاخود زوو بەدیهاتنیان وەستاوە، ئەگەر ئێمە خاوەنی یەقین بووین بەرامبەر بە حیکمەتی بوونمان لەم دونیاو دەسەڵاتی پەروەردگار، ئەوا توانای ئارامگرتن لەسەر ناخۆشیو تەنگوچەڵەمەکانی ژیان پەیدا دەکەین، بە پێچەوانەوە تووشی داڕووخانی دەروونیو جەستەیی دەبینو ناتوانین بەرگەی ئازارەکان بگرینو خۆمان تووشی سەرلێشێوان دەکەین، دواجاریش بە ئاواتو مەبەستەکانمان ناگەین.

* دڵنیایە لەوەی دونیا بۆ هیچ کەس پاوان نەکراوە، لەسەر زەوی کەس نییە، کە هەموو داواکارییەکان وەچنگ کەوتبێتو بێخەم بێت. واتە ئەگەر شتێکی پێبەخشراوە، ئەوا شتێکی تری لێسەنراوەتەوەو بە پێچەوانەشەوە، چونکە ئێرە هەوارگەی هەمیشەییمان نییەو پێی نامۆین.

* هەروەها چەندان بەڵگەی بەهێزمان لەبەر دەستدایە، لە زەمەنەکانی پێش خۆماندا، کە ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتیو تاڵییەکان، هۆکاری سەرەکیی سەربەرزیی پێغەمبەران بوون، هەروەك لە ژیاننامەی هەریەکە لە پێغەمبەر (موسا، عیسا، ئیبراهیم، یوسف، ئەیوب)، سەلامی خوایان لێ بێتو چەندان نێردراوی تر. دواجار پێغەمبەر محەممەد (درووودو سڵاوی خودای لەسەر)، ئەگەر ژییاننامەی هەریەك لەمانەمان بەرگوێ کەوتبێت، کە چەندە خۆڕاگر بوون، لە کاتێکدا بەقورسترین تاقیکردنەوەدا تێپەڕیون، ئەوا بێگومانم کە دەرسو پەندێکی گەورەیان لێوە فێربووین، ئەویش ئارامگرتنە لەسەر ناخۆشییەکانو چاوەڕوانی سەبرگرتن، تا کاتی سەرکەوتن، چونکە خودای گەورە هەر خۆی بەڵێنی داوە بەوانەی خۆڕاگرن، هەر لە دونیادا جێگەو مەقامی بەرزیان پێدەبەخشێت، جگە لە پاداشتی نەبڕاوەی ئەو دنیا.

بۆیە دەڵێم: ئەگەر تائێستە دەرکت بە هەموو ئەمانە نەکردووە، ئەگەر ناڕەحەتییەکانی ژیان، بێزارو ماندووی کردوویتو خەریکە چۆکت پێدا دەدات، ئەوا دڵگران مەبەو تەسلیم مەبە، بزانە کە چاودێرێك بەسەرتەوەیەو ئاگای لێتەو بە وردی چاودێریت دەکاتو مەبەستییەتی تاقیت بکاتەوە، چونکە مەرج نییە، ئەو ئامانجو ڕێوشوێنانەی، خۆمان ڕەنگمان بۆ کێشاوە لە دنیادا، ڕێگەی سەرکەوتنمان بن، بزانە بەدی نەهاتن، یان درەنگ بە ئامانجگەیشتنت، حیکمەتێکی خودایی تێدایەو دیارە مەبەستییەتی ڕێگەی سەرکەوتنت بۆ ڕاست بکاتەوە، بەڵکو ڕەنگە تۆی بۆ ئامانجێکی زۆر لەوە گەورەترو بەرزتر دانابێت، بۆیە ئەگەر لە هەرجارێکدا، سکاڵای حاڵی خۆمان بەو بۆنەیەوە کرد، ئەوا لە نەزانیو پەیپێنەبردنی خۆمانەوەیە، ئاگاداربە.. نهێنی سەرکەوتنی ڕاستەقینەت پەیوەستە بەڕادەی خۆڕاگریت بەرامبەر ناخۆشیو نەهامەتییەکانی ژیان، بەڵکو شتێك بە ناوی نەگەیشتن بە سەرکەوتن لە ئارادا نییە، ئەوەی هەیە، لە زوو، یان درەنگ گەیشتندایە.

# مرۆڤو تواناکانی

شاخەوان جەبار



گەرچی مرۆڤ چەندین جۆر هێزی بەدیهێنانی هەیە، تا بتوانێت بەهرەو تواناکانی خۆی لە جیهانی نابەرهەستەوە بێنێتە جیهانی بەرهەست، وەك: تواناکانی جەستەییو توانای ژیریو توانا مەعنەوییەکانی، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها ئەو توانایانەی مرۆڤ دەخەینەڕوو کە لە بونیاتنانی کەسێتی هەر تاکێك بوونی هەیەو دەتوانین بیکەینە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی لە ئەرکەکەیدا، بە تایبەتی لە بەرپرسیارێتیو بەرپرسیدا، بۆیە گەربێتو ئێمە لەم ڕووەوە مرۆڤ بە پێی تواناکانی هەڵبسەنگێنین، ئەوا مرۆڤ دابەش دەکەین بۆ ئەم جۆرانە:

**یەکەم: لە ڕووی دەربڕینەوە:**

* وتار: ئەمجۆرەش ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە دەتوانن لە ڕووی قسەو گفتوکۆ، لەگەڵ بەرامبەرو گوێگرەکانی باش بدوێتو لە گفتوکۆکانیدا بە کاریگەری وتەو چۆنێتی دەربڕینو دوانی کار لەسەر گوێگرەکانی بکات.

* لە ڕووی نووسینەوە: ئەو کەسانەن کە لە ڕێگەی نووسینەکانیانەوە پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆ لەگەڵ خوێنەرەکانیان دروست دەکەن، هەڵوێستو مەبەستەکانیان لەو ڕێگەیەوە بەیان دەکەن.

* ئەو جۆرە مرۆڤانەن کە هەردووخاڵەکە لە پێکهاتەی کەسێتیاندا بوونی هەیە، واتە بە شێوازی جوان دەتوانن لەگەڵ بەرامبەرو گوێکرەکانیاندا بدوێن، لە هەمان کاتیشدا لە ڕووی بەهرەی نووسینیشەوە بە تواناو خاوەن هزرو جێگە دەستنو خاوەن خامەن.

**دووەم: لەڕووی کارگێڕییەوە:**

ئەمەش ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە ڕووی ڕاپەڕاندنو جێبەجێکردنی کارەکانییەوە چالاكو سەرکەوتوون، تەنانەت هەندێجار دەکرێت ئەم کەسانە بنەمای یەکەم لە کەسێتیاندا بوونی نەبێت.

لە ڕاستیدا ئێمە دەبێت پێش ئەوەی نیشانەی ڕاست لە بەردەم کەسێتی هەر کەسێکدا دابنێین، پێویستە بە یەكێك، یان هەردووخاڵەکە هەڵی بسەنگێنینو هەڵوێست لە پێناسەی کەسێتیاندا بکەین، جا ئەو کاتە بۆ ماندەردەکەوێت کە کەسێتی ئەو کەسانە تاچەندێك هاوتەریبە، یان هاودژە لەگەڵ پۆستەکەی.

لە ڕاستیدا ئەمە بۆ بڕیاردانی سەرەتاییە، واتە تەنها بۆ دەستنیشانکردنو دەستبەکاربوونی ئەو کەسەیە، بەڵام ئەوەی لەمە گرنگترە ئەوەیە، پێویستە پاش بڕیاردان ئێمە بۆ هاوتای هەر یەكێك، یان هەردوو خاڵەکە(فلتەر)ێك بە کاربهێنین، ئەویش ئەوەیە کە بزانین تاچەندێك ئەو کەسە لە ئەرزی واقیعدا هەریەك لەو خاڵانەی کە پێشوەخت پیشانی ئێمەی دەدا، جێبەجێی دەکات، ئەگەرنا، بێ بوونی ئەم (فلتەرە) ئێمە بەکاری ئەو کەسانەی کە لە پۆستیاندا فریودەرن، فریو دەخۆینو ئەوەی کە ئێمە لە سەرکەوتنی ئەم کەسانە چاوەڕێین بانێکەو دووهەوا.



درەخشان بەهادین

# بۆ بەخشراویت بەهانەیەك ساز بكە!

ژیری ئەو تاكە نیعمەتەیە كە مرۆڤەكان هەریەكەیان بە بەشو ئەندازەی خۆی ڕازییە، لە زۆرو كەمی ئەو بەخششە گلەیی ناكەن، چونكە هەر كەس لە ئاستی خۆی، خۆی بە ژیرو خاوەن ئاوەزتر دەزانێت. بۆیە بابەتی ئەمجارە دەكرێت ڕێگە چارەو وەلامێك بێت بۆ هەموو ئەوانەی كە دەڵێن: بۆچی مرۆڤەكان هەمووان وەك یەك نین؟ هەندێك كەس زیاتر لە هەندێكی دیكەیان پێبەخشراوە!

وەلامی ئەم پرسیارە لە گوزەری قۆناغە جیاكانی ژیانو چەند نموونەیەكی ڕۆژانەی ژیانمان دەستدەكەوێتو بەرجەستە دەبێت، بەمەش زیاتر لە مەبەستی بابەتەكە دەگەینو ئاسۆی ڕامانو تێگەیشتنمان ڕوونو فراوانتر دەبێت.

**نموونەی یەكەم:** ئایا تا ئێستا لە تاقیكردنەوەیەكدا بەشداریت كردووە، كە وەلامی هەندێك لە پرسیارەكان نەزانیتو ناچاربیت شوێنی وەلامدانەوەكە بە بۆشیو بێ وەلام بهێڵیتەوە؟ یان بە هەندێك وشەو ڕستەی پەرشوبلاو كە بە ڕواڵەت هیچ پەیوەندی بە بابەتو پرسیارەكەوە نەبێت، وەلام بدەیتەوە؟

ئایا سەرنجت داوە كە ئەگەر بە ڕاستی پرسیارەكە دژوار بێت، یان مامۆستای وانەكە لە ئێوە ڕازی بێت، هەر ئەوەندە بەسە كە شتێك بنووسیت تا بۆ مامۆستای وانەكە بێت بە بەهانەیەك بۆ نمرە پێدانت! بە هەر جۆرو شێوەیەك بێت هەرئەوەی كە هیممەتت كردووەو پرسیارەكەت بێ وەلام نەهێشتووەتەوەو وەلامێكت نووسیوە، وەلامێك كە لەوانەیە لە زۆر كاتدا وەها ڕاستو گونجاو نەبێت، بەلام هەر ئەو هەوڵە بە ڕواڵەت بێ ئەنجامو لە خۆوە لە هەوڵ نەدانو دەستەودەستی زۆر باشترەو دەتوانێت بەهانەیەك بێت بۆ مامۆستای وانەو سەرپەرشتیاری تاقیكردنەوەكە تا ئێوە لە پێدانی نمرە بێبەش نەكات، هەر چەندە كەمیش بێت.

**نموونەی دووەم:** هاوڕێییەكم وتی: ماوەی چەند ساڵێك لە مەوبەر چەند ماسییەكی ڕەنگاوڕەنگم بە مەبەستی جوانی بۆ ماڵەوە كڕی، بەلام هەر یەكەیان بە هۆكاری جیاجیا لەناوچوون، جگە لە ماسییەكی ڕەشی بچووك نەبێت، كە توانی بژی. هاوڕێیەكەم دەیگووت: "زۆر جار لە بیرمان دەكرد ئاوەكەی بۆ بگۆڕین، بەلام ماسییەكە لە دژوارترین بارودۆخدا دەژیا). بە جۆرێك جارێكیان ئەو تۆنگە شووشەیەی كە تێیدا بوو لە بەرزییەك كەوتە خوارەوەو ماسییە بچووكەكە ماوەیەك لە سەر زەوی گیانی دا، بەلام كاتێك خستمانە ناو پەرداخێك ئاوەوە دووبارە هەوڵو پەرۆشی خۆی بۆ ژیان نمایش كرد. ئەو وتی: ئێستا هەر ئەو ماسییە بچووكە بووە بە سومبولی ئومێدو هیوای ماڵەوەیان، بە جۆرێك ناوی "ئومێد"یان لێناوە. ئێستا بۆ "ئومێد"ئاكواریۆمێكی بچووكمان كڕیوە، بۆ دۆزینەوەی جۆری ئەو ماسییانەی كە هاوخانەوادەی ئەون، تەواوی ئەو فرۆشگایانەی كە ماسییان بۆ جوانی لا دەستدەكەوێت گەڕاون. ئەو وتی: ماسییە بچووكەكە بە هەوڵو گیان سەختی خۆی وایكرد كە بەهانەیەك هەبێت بۆئەوەی سەرمایەگوزاری زیاتری بۆ بكرێت. ئەم بنەمایە سەبارەت بە تەواوی تاكەكانو هەموو دەستەو گروپێك ڕاستەو جێبەجێ دەبێت.

**نموونەی سێیەم:** لە زۆرێك لە كارگە كۆنو خاوەن خزمەتەكان، ژمارەیەك كرێكارو خاوەن ئەزموونی بەساڵاچوو هەن، كە ساڵانێكە سەرگەرمی كارو خزمەتن. لە بەڕێوەبەری كارگە زیاتر لە ئەندامێكی خانەوادە نزیكترن. هۆی ئەو نزیكیو خۆشویستنە ئێجگار زۆرەی ئەو كرێكارو كارمەندە پیرو بە ئەزموونانەش بۆ بەردەوامبوونو مانەوەیان لە گەڵ بەڕێوەبەری كارگە لە تەواوی هەورازو نشێویەكانی كارگەو ڕۆژە سەختو بە ئازارەكانی كاری كارگە دەگەڕێتەوە. واتە زۆر كات كە كارگە كەوتووەتە تەنگژەو گێژاوی زەرەروزیانو شكستەوە، زۆرێك لە كارمەندەكان كارگەو بەڕێوەبەریان جێهێشتووە، ئەم كرێكارە خاوەن خزمەتانە ماونەتەوەو بوونەتە بەربەست لە بەردەم كەوتنو تیاچوونی كارگەكەیان. هەر ئەو دڵسۆزییەی ئەوان لە ڕۆژانی كارو دژواریدا، بووەتە هۆی ئەوەی كە ئێستا كارگە بگاتە ناوبانگێكی دیار. هەر

لەبەرئەوەشە ئەو کەسانە لای بەڕێوەبەری کارگەکەیان ڕێزو پلەیەکی تایبەتیان هەیە. ئەگەر بەڕێوەبەرێک بیەوێت لە کۆتایی ساڵدا کارمەندەکانی بە پێدانی پاداشت هان بدات، ئەوا هەمیشە بەدوای چالاکی دیارو بەرچاوی ڕۆژانەی کارمەندەکانیدا دەگەڕێت، کە ببێتە بەهانەیەک بۆ پێدانی پاداشتەکە. بۆ نموونە ئەگەر دوو کەس کاتو شوێنی کارکردنیان یەک بێت، یەکێکیان تەمەڵو خۆخۆشەویست بێت، کە کاری خۆشی بە زۆر ئەنجام بدات، ئەوی تریان چالاکو زیرەک بێت، کە جگە لە کاری تایبەتی خۆی، کاری تریش کە لەوانەیە زۆر پەیوەندی بە پیشەکەیەوە نەبێت، ئەنجام بدات. بێگومان لە کاتی پاداشتکردندا جەنابی بەڕێوەبەر بۆ کارمەندە چالاکەکە سوودو پاداشتێکی زۆرتر لە بەرچاو دەگرێت، بۆ ئەم کارەشی بەهانەیەکی دەبێت، ئەو بەهانەیەش خودی کارمەندە زیرەکو چالاکەکە بووە.

بێگومان شتێک لە بارەی"یاسای هێزی ڕاکێشان"ەوە دەزانن، هەر ئەو شتەی بە ناوی نهێنی گەورەی سەرکەوتن ناسراوە، کە لە زۆر کتێبو فیلمدا بە "ڕاز"ناوی هاتووەو باسکراوە. زۆرێک لە مرۆڤە تەمەڵەکان تێگەیشتنی زۆر سادەو خۆویستانەیان بۆ یاسای هێزی ڕاکێشان هەیە، بە شێوەیەک بۆ گەیشتن بە هیواو ئاواتەکانیان دەڵێن: تەنها ئەوەندە بەسە کە ئەو هیواو ئاواتە لە دڵی خۆتدا بڵێیتەوە، دواتر تەنها چاوەڕوان بە، تاکو هاتنە دی ئاواتەکەت بە شێوەی ڕاستەقینە لە ژیانی خۆتدا ببینیت.

بە زمانێکی سادەتر چاوەڕوانی بردنەوە بین، بێئەوەی حسابێکی بانکیمان هەبێت. ئەمە لە کاتێکدا کە یاسای هێزی ڕاکێشان بە هیچ جۆرێک وانالێت، کەسانێک کە بەو جۆرە تێگەیشتوونو ڕەفتاریان کردووە، واتە تەنها بە هیواو ئاواتێکی وشکو بەتاڵو بیری سادەی خۆیان چاوەڕوان بوون، تا مەلی ئامین دەستبەجێ ئارەزووەکانیان بهێنێتەدی، ئەوا دوای ماوەیەک سەرکزبوونو گۆڕاون بۆ دوژمنێکی سەرسەختی ئەو یاسایە. بە شێوەی ئەو پیاوەی کاتێک لە سەر سندوقێکی یارمەتیدان نوسراوێک دەخوێنێتەوە کە ئەگەر هەر کەس بڕە پارەیەک بخاتە نێو سندوقەکەوە، ئەوا لە سەدان بەڵاو ڕووداوی نادیارو نەزانراو، پارێزراو دەبێت. دوای ئەوەی بڕە پارەیەک دەخاتە ناو سندوقەکەوە بە ئارامیو بە خەیاڵی ئاسودەوە لە نێو شەقامێکی قەرەباڵغدا دەکەوێتە پیاسە کردن، بەو خەیاڵەی کە ئەو بڕە پارەیە دەیپارێزێت، بەڵام کاتێک بە هۆی سادەییو بێخەیاڵی خۆی، ئۆتۆمبێلێک لێی دەداتو دەکەوێتە گۆشەی نەخۆشخانەوە، ئەو کات بە سەر کەسانێک کە دەیانەوێت پارە بخەنە نێو سندوقەکەوە هاواری دەکرد دەستڕاگرن، چونکە سندوقەکە خراپ بووەو بە باشی کار ناکات!

کەسانێک کە یاسای هێزی ڕاکێشان بە تێڕوانینێکی ئاسانو بێ هیچ ئەرکو ماندووبوونێک مانا دەکەن، لە بنەڕەتەوە لە هەموو شتێکی ئەو یاسایە بە هەڵە تێگەیشتوون. یاسای هێزی ڕاکێشان بە زمانێکی سادە ئەو دڵنیاییەمان پێدەدات کە ئەگەر ئارەزوویەک بە ڕوونی لە دڵدا بڵێینو دوو پاتی بکەینەوە، ئەو هیواو ئاواتە بە شێوەی بە دیهاتوو لە بەرامبەر هزری خۆت وێنا بکەیت. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو شتانەی کە بە هاتنە دی ئەو هیواو ئارەزووە دەستمان دەکەوێتو بۆمان فەراهەم دەبێت، بە جۆرێک بە تەواوی بوونمانەوە هەستی پێ بکەین. واتە بۆ نێو ئەو ژیانە نوێو دونیا جیاوازە سەفەر بکەین. بەو جۆرە بەدیهێنەرمان بەهانەیەکی دەبێت بۆ ئەوەی ئەو ئاواتو هیوایەی کە لە سەرەتادا ڕواڵەتێکی نادیاری هەیە، بگۆڕێت بۆ ڕاستەقینە. واتە سەرەتایی چوونمان بۆ نێو ئەو ژیانە نوێیە بۆ فەراهەم بکات. بەڵام هاتنە دی ئاواتەکانو دەستکەوتنیان هەروا بە خۆڕایی نابێت، بەڵکو دەبێت ئێمە بە هەوڵدانو ڕاستیو پێداگریو بەردەوامبوونو هەروەها دڵنیابوونمان بەهانەیەکی تەواو بۆ بە دیهاتنی ئاواتەکانمان سازو فەراهەم بکەین.

زۆرێک لە لاوانی ئەمڕۆ بە هۆی خۆشەویستی زۆری دایکو باوکیانو هەروەها بە هۆی فەراهەمبوونی زۆرێک لە خواستەکانیان لە تەمەنی منداڵیو نەوجەوانیاندا، سەرەڕای گەورە بوونیشیان، هەروا هەست دەکەن کە دیارییەکی تاقانەن لە ژیاندا، دەبێت ژیان هەرواو بێ هۆ، تەنها لەبەرخاتری خودی خۆیان، هەرچییەکیان بوێت پێیان ببەخشێت. ئەو لاوە زۆر ویستو بە داوایانە کە ئێستا زۆرێکیان گەیشتوونەتە تەمەنی پێگەیشتنو کامڵبوونەوە، بێ هیچ هۆیەک وا لە ژیان دەڕوانن و چاوەڕێی دەکەن کە هیچ ڕووداوێکی ناخۆش بۆیان ڕوو نەدات، دەستێکی شاراوەو پشتیوان بۆ هەر کارێک کە ئەنجامی دەدەن لەوان پشتیوانی بکات. هەر بۆیە زۆرجار بە پێچەوانەی یاساو ڕێسای نەگۆڕو ڕوونی سروشت، کۆمەڵە کارێک دەکەن، چاوەڕوانن بەدیهێنەری سروشت لە بەر ڕووی پیرۆزی ئەوان بە جۆرێک یاسای بنەڕەتیو بونیادی بەدیهاتنو بوونیان بۆ ڕابگرێت، یان بگۆڕێت. بۆ نموونە لە بەرزی زۆرەوە خۆیان هەڵدەدەنو چاوەڕوانن دەستو قاچیان نەشکێت، یان کاری توندوتیژی ئەنجام دەدەنو لە یاسا سەر پێچی دەکەنو دەیانەوێت کەس قسە نەکاتو سزا نەدرێن. بەڵام دونیای خەیاڵاوی ئەو لاوانە زۆر ناخایەنێت، دوای ماوەیەک کاتێک دونیای ڕاستەقینە بە مەیلی ئەوان ناجوڵێتەوە، لەگەڵ وەڵامی سەختو هەندێجار بە ئازاری ژیان ڕووبەڕوو دەبنەوە، ئەو کات تێدەگەن کە حەقیقەت چییە؟

بۆیە دەستبەجێ لە دەروونەوە دەڕووخێنو لە نێو دونیای دەروونی خۆیان ون دەبن. ئەو لاوە زۆر ویستو بە داوایەی دوێنێ دەگۆڕێت بۆ تاکێکی سەرکزو ترسنۆک کە لە ژیاندا لە هیچ شتێک دڵنیا نییە، بە ڕوونی نازانێت ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدات بەرهەمێکی دەبێت، یان ئەو ڕێگەیەی کە پێیدا دەڕوات دەیگەیەنێتە مەبەست، یاخود نا؟

بۆیە تۆش نیگەرانی بردنەوەو وەڵامو بە دەمەوە هاتنو گەیشتنی حەتمی، بە مەبەستو ئامانجەکانت مەبە، لە بری ئەوە کارێک بکەو جیاوازییەک بهێنە کایەوە، بەهانەیەک ساز بکە، تاکو ژیان بە بینینی ئەو جیاوازیو بەهانەیە بۆ تۆ ڕۆڵێکی تر لە بەرچاو بگرێتو سەرنوشتێکی تر هەژمار بکات. دەست لەسەر دەستدانان، لەوانەیە ئاسانو بێ کێشە بێت، بەڵام هیچ ڕێگایەک بە مەبەست ناگەیەنێتو هیچ سوودێکی نابێت، بۆیە هەوڵێک بدەو کارێک بکە، چونکە هەموو زاناکانی یاسای هێزی ڕاکێشان بێ هیچ جیاوازییەک لە سەر ڕستەیەک یەک ڕاو یەک قسەن، ئەویش ئەوەیە: "لە ژیاندا بێکارکردنو هەوڵدان هیچ ئارەزوویەک زات ناکاتو هەلو ئیزنی هاتنەدی پەیدا ناکات". کەواتە چی لەوە باشترە کە کۆبەندو خەملاندنی کارو هەوڵەکانمان ژیرانەو حساب بۆکراو بێت، کە دەبێتە هۆی ئەوەی بەهانەی هاوڕێی بوونو یارمەتیدانی خوداو هۆکارەکانی جیهانی بوونمان بۆ فەراهەم بێت.

لەبەرئەوە لەمەودوا هیچ پرسیارێک بێ وەڵام مەهێڵەوەو لە هیچ تاقیکردنەوەیەک هیچ لاپەڕەیەک بە سپێتیو نەنوسراوی ڕادەست مەکەرەوە. گرنگ نییە چەندە بە تواناو لێهاتوویت، یان لێهاتوویيو تواناکانت کەمنو جێی بایەخ پێدان نین، دیسان دەستیان لێبەر مەدەو دەست لەسەر دەست دامەنێو ڕامەوەستە، هەر ئەو توانا کەمو بە ڕواڵەت بێ سوودانە بخەرە کار، چونکە زۆر کات گرنگ ئەوە نییە بگەیتە مەبەست، بەڵکو گرنگتر لەوە، ئەوەیە کە بیسەلمێنیت شایستەی سەرنجدانو پاداشتو پێشکەوتنت هەیە.

گرنگتر لە گەیشتنو وەڵامو بە دەمەوە هاتن، سەلماندنی شیاوی خۆتانە بۆ بە گرنگ زانینو بایەخ پێدانت، ئەمە فەراهەم نابێتو نایەتە دی، مەگەر ئەوەی بەهانەیەکت بۆ قەدر زانینو ڕێزو بەخشراویت پێبێت. کەواتە: "بۆ بەخشراویت بەهانەیەک ساز بکە!"



شاگوڵ عوسمان

# خواستی بەخشین، باشترین پاداشتە

لە نێو سروشتی ئەمڕۆی ژیانماندا سات بە سات کارێکمان لەسەرە ئەنجامی بدەین، هیچ کات بێ کارنین! تەنانەت کاتێك خەیاڵ دەکەینەوە لە خەیاڵی خۆماندا کارێك ئەنجام دەدەین! ژیانمان پڕە لە کێبڕکێ، یان پێشبڕکێ، ململانێکان هەر بەردەوامن ئەم ململانێیانە لە ئەنجامی ئەوەیە نازانین کامیان هەڵبژێرین، هێشتا بڕیاری خۆمان یەك لایی نەکردووەتەوە، چاکەکردن کاریگەرترین پەیوەندییە کە مرۆڤ بتوانێت دروستی بکات لە ڕێی زمانو هەموو ڕەهەندە مەعنەوییەکانی تری ڕۆح کە تێیدا بەشدارە، چاکەم لەگەڵ دەکەیت.. پشکم هەیە لە بەشەکەدا؟! چاکەکردن پشووی دەستێکە بۆ ژیان، هەنگاوێکە بۆ یارمەتی، زەمەنێکە بۆ دەستکەوت، دڵێکە بۆ خۆشحاڵی، چاوێکە بۆ ڕۆشنایی، قومێك ئاوە بۆ تینوێتی، زمانێکە بۆ گفتوگۆ، لێوێکە بۆخەندە، گیرفانێکە بۆ ئاسودەیی، سۆزێکە پڕ لە وەفا، ئومێدێکە پڕ لە چارەسەر، سنوری نییە، پڕە لە ڕەها بوون، پڕە لە خۆشەویستیو ڕێز، پڕە لە یارمەتیو لێپرسراوێتی، خەونێکە دەبێت بەدەستبهێنرێت، نییەتێکە پڕ لە ڕاز، هەموو ئەمانە ئاسوودەمان دەکەن..

بە چاکەکردن ئێمە لە زیادەڕۆیی بە دوور دەبین، من تەنها هۆکارێکم، یاخود ڕایەڵێکم بۆ گەیاندن، ئەوە بەشە، ببورە کە پێشوەخت نەگەیشتووە بە دەستت، من بە چاکەکردن لەگەڵ تۆدا، چاکە لەگەڵ خۆمدا دەکەم، کێشی خۆم زیاد دەکەم، خێر بە خۆم دەکەم، حسابەکەم زیاد دەکەم.

ئەو کەسە کێ بوو، یەکەم پێکەنینی بە من بەخشی؟ خێرێکی بۆ خۆی چڕی، ڕەنگە تا ئێستا ڕووخسارم تووڕە بێت بەرامبەری، ئەو کەسە کێ بوو بە هۆکاری ڕووخسەتی ژیانی من؟ ئەو پیتە چی بوو فێربووم ناوی کێ بوو؟ یەکەم هەنگاو ڕۆیشتم کێ بوو دەستی گرتم؟ کێ بوو ڕۆژە تەزیووەکانی پێ گەرم کردمەوە؟ ژەمە برسییەکانی منی تێرکرد؟ کێ بوو یەکەم جلی جەژنی بۆ کڕیم؟ کێ بوو یەکەم هاوڕێم؟ کێ بوو ژەم ژەم چاودێری دەکردم؟ لە تەنیاییەکانمدا فرسەتی خۆشەویستی خۆی پێدام؟ لە نێو ترسەکاندا بوێری پێبەخشیم؟ لە نێو بێ ئاگاییەکانمدا ئاگاداری کردمەوە؟ پێویستی ژیانی پێدام، ئەو خوشکە کێ بوو ئاوێنەیەکی لە دایك پێدام، ئەو برایە کێ بوو پشتێکی لە باوکێتی پێدام، ئەو پەرتوکە، ئەو دێڕە، ئەو وشەیە، تەنانەت پیتو ئەو ئیشارەتەی ژیانی پێ ڕاسپاردم، کێ بوو ئومێدی ژیانی دایەوە بە ئێمە؟؟

تۆش لەگەڵ من بیرکەرەوە، زۆرشتی تریش، یەکەم شەونخونی بۆنەخۆشییەکانم کێ بوو؟ یەکەم پرسیار کێ بوو وەڵامی دامەوە؟ یەکەم دڵخۆشکەرم کێ بوو؟ کێ بوو دەستی گرتمو لە کەوتنەکاندا یارمەتی داینو جارێکی تر هەڵسانەوەی پێداین؟ من نەمتوانی.. دڵنیام تۆش ناتوانی بیانژمێریو ناتوانی بیاندۆزیتەوە، دەزانم دەبێت لە شوێنێکدا بووەستین چی تر هیچ شتێك بە بیرماندا نایەت، ژیانو تەمەن، ڕووخسەتمان نادەنێ، تا هەمووی بگەڕێنینەوە! ئەوە لەدەستی منو تۆدا نییە، من لە خەیاڵی ئەوەدام دەبێت تۆ بگەیتە چ خاڵو چ سەنتەرێ؟ ئەوەی ئێستا ماوە نەبەشی درکی منداڵیمان دەکات، نە گەنجێتی، نەپیری! گەر تەنها بە دوای یەکەم کەسدا سۆراخ بکەین؟؟ ئەی دەبێت چەند ژمارە بدەین بە هەموو ئەو کەسانە! کێ بوو لە بەرزاییەکاندا دەستی منیشی گرت؟ کێ بوو لە نشێوییەکاندا دەریهێنام، کێ بوو لە یەکەم بەرهەمی درەختو نەمامی سەرگوزەشتەی ژیانی، تامی شیرینی پێدام، کێ بوو؟ گەر بۆشت بگێڕمەوە دڵنیام بە چەند چرکەیەك کۆتایی باسەکە دەهێنم، بە مەرجێ خاوەنەکەی.. کاتژمێرو ڕۆژو ساڵو سەدەی بۆ خۆشحاڵیو ڕزگاری منو تۆ، تەرخان کردووە.

لە شەوێکی زۆر سارد، وشکاییەك نەبوو بۆ سوتاندن، لە ڕۆژێکی بارانلویدا، ئاوێك نەبوو بۆ خواردنەوە، خەمێك هەبوو.. بەبێ مەوعید چاکەخوازێك هات (کاتی بۆ نییە)، لە تیکەیەك ناندا لە پارچەیەك قوماشدا، قاچەکانمان لە جوتێ پێڵاودا،

هەنگاوەکانی لە چاکەیەکدا بۆ خودا بەجێهێشت، نەخۆش بووین، ئومێد هەبوو بۆ چارەسەر! بەڵام لە کوێ؟ پێویستمان بە چاکەیەك هەیە، خەونەکەمان هاتەدی، بە سڵاوێك ماڵئاوایی لێکردین، لە ناکاو ئۆتۆمبێلێك بە شەقامەکەدا تێپەڕی، هەرچەندە من هێشتا لە خەیاڵی خۆمدا بووم، بیرم لە تۆ دەکردەوە لە شەقەمەکان بەبێ هیچ تەرازوویەك مامەڵە دەکەیت، فڕەکەت دانەهێناوە والە شەقامیت، جلەکەت نەگۆڕیوە وا لە گۆڕەپانیت، نەخۆشیت کەچی هێشتا بێ چارەسەریت، نزام دەکرد، لە نەخۆشخانە بووم، شۆفێریکی تر منی هێنابوو بۆ خەستەخانە، یەکێك دەیگوت: هەڵهاتووە، یەکێکی تر: نا هەڵنەهاتووە، ئەوەی گرنگ بێت چاکەیەکە ئەنجامدراوە، گرنگ ئەوەیە پێشبڕکێ کراوە بۆ چاکەکردن.

ماندووم، تووڕەم، کەچی پێدەکەنم، لە ڕووخسارت دەڕوانم، ئارام دەگرم، گرەنتی بۆ ئەمانە تەنها چاکەیەکە، سەبوریم پێدەدات، ڕووخسارم گەشاوە دەکاتەوە، نیازەکانم پڕ لە ئومێد دەکات، دەست لە ژیانی خۆم هەڵدەگرمو بەرەو خۆشبەختییەکی تر دێم، سەرمایەی من دیدی چاوەڕوانی چاکەیەکی باشترە، لەوەی پێشوتر، چاکەکردن دیارییەکە بە من، بە دیدم، منیش لە نێوان بەخشەرو وەرگردام، هەروەك پێشەواکەم فەرمویەتی: بەخشەر لە لای خودا خۆشەویسترە، هەرچەندە منیش جارێك دەبەخشم، جارێك وەردەگرم، هەموومان بەم ڕۆژگارە چاکە دەکەین، ئاو دەخۆینەوە، دڵمان پاك ڕادەگرین، چاوەکانمان دەپارێزین، حەز بە زەمکردنی براوخوشکەکانمان ناکەین؟! دەستی منداڵەکان دەگرین، بەشدارییان پێدەکەین، لە خواردنی لەتە خورمایەك، کاردەکەین بە چاکە لە هەڵەکان پاشگەزدەبینەوە، ناگەڕێینەوەو نەهییان لێدەکەین، ناوتان بە باشە دەهێنمو ڕاسپاردەکانتان دەپارێزم، وەکو هی خۆم، ئەوەی بۆخۆم پێمخۆشە بۆ تۆش پێمخۆشە، ڕێز لە هاوسێکانم دەگرم، خۆشحاڵم بەسەرکەوتنی ئەوانی تر، لەگەڵ هاوڕێکانمدا بە وەفام، نییەتەکانم تازەدەکەمەوە تا نە شتێك هەبێت لە زهینمدا، نە بە ناوی ڕووپامایی، نە بە ناوی هاوەڵ پەیداکردن، بۆ ئەو کارەی بە نیازم چاکەیەك بە ڕوویدا بکەمەوە، چاکەکەم بە دە پاداشت دەژمێرێت، دەیدەینە دەست تۆ خودایە!

ببورە من ناتوانم پاداشتت بدەمەوە، سنور مەدە بە چاکەکانت بۆ منی بەجێ مەهێڵە! بۆ خودای جێ بهێڵە، تەنها ئەوە پاداشتت بداتەوە، لە زەمەنێکی تر، لە کەسێکی تر، لە چاکەیەکی تردا، گرنگ ئەوەیە تۆ خۆشحاڵ بیتو ئاسوودەبیت، لەو بەخشینە، لەو دڵسۆزیو خۆشەویستییە، بەرامبەر بە من، بە تۆ، بە هەمووان، چونکە ئەوە من نیم بتوانم: نەخۆش بیت چارەسەرت بکەم، فێری وشەکانت بکەمەوە، پێییەکانت زەوی بگرێتەوە، لە شەوێکی درەنگ بێم بە هاوارتەوەو ڕوویەکی سپی لە ژیانت بۆ سبەی مسۆگەر بکەم، لە نەکردنی کارێکی نادروست پاداشتت بدەمەوە، هەرگیزاوهەرگیز من توانام نییە، من بێدەسەڵاتو بێ توانام خێر بە خۆشم دەشێت، ئەوە من نیم کە تێرت بکەم، کە دەست بگرم لە نێو ڕیزی خۆشەویستییەکان ناوت تۆمار بکەم، تۆ لە پێناو خودا من بەخشیوە، ببورە ئەمە مانای بێ وەفایی من نییە، هەرگیز!! مانای بەخشینە تەنها لەبەرخاتری خودا.. چاکەکردن لە بەرخودا بەردەوامی زیاترمان دەداتێ، ئەوە خودایە دەبێت هەمووان بە وەفابین بەرامبەری، هێندە چاکەی بەسەرمانەوەیە لە ژماردن نایەت.. مرۆڤ چ دروستکراوێکی بێدەسەڵاتە.. توانای ژماردنی هیچ شتێکی نییە، تەنها بە کاربەرە، خودا لە پاداشتدا شارەزایە، دەزانێت لە کوێدا پێویستە، ئەوە پەیمانێکە لە نێوان خوداو بەندە خۆشەویستەکانی خۆیدا، خودایە تەنها تۆ ڕازەکانمان ڕاگیراو بکە بۆ خۆت. تەنها خۆت دڵسۆزمان بکە بەرامبەر بە خۆت، هەرتۆی ئیزنمان دەدەیتو هەرتۆی سەرگوزشتەیە لە خێرو چاکەمان بۆ مسۆگەردەکەیت، خودایە پارێزگاریمان لێبکە.

## پیرۆزبایی

به ناوی بەڕێز خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەرو ستافی کارای گۆڤاری بڕیارەوە، چەپکە گوڵی پیرۆزبایی پێشکەش بە خاتوو

(پەیمان بەرزنجی)

ئەندامی دەستەی نووسەرانی (گۆڤاری بڕیار) دەکەین، بە بۆنەی وەرگرتنی بڕوانامەی (دکتۆرا) لە بواری پەروەردەدا، بە پلەی نایاب، سەرکەوتنو سەرفرازیو تەمەن درێژی بۆ خزمەتی گەلو نیشتمان بە ئاوات دەخوازین، خوای گەورە نموونەیان زۆر بکات.




زاهیر زانا

ژیانمان سەرمایەیەكی بە نرخو بێ وێنەو پڕ بایەخە، دەبێت لە چۆنییەتی بەگەڕخستنی زۆر بە ئاگاو وشیارو لێزانو وریابین، لەبەرئەوەی تەنها یەكجار دەرفەتی ژیانمان هەیە لە دونیاداو توانای دووبارەكردنەوەو چوونەوە سەرەتای فیلمی تەمەنی خۆمان نییەو یەكجار ئەم دەرفەتەمان پێدراوە، بۆیە پێویستە بەوپەڕی كارامەییەوە كاربكەین بۆ بەدەستهێنانی زۆرترینو باشترینو نایابترین دەسكەوتەكانی ژیانو نرخو ڕێزی هەموو چركەساتێكی ژیانمان بزانینو خاوەنی پەیامێكی ڕوونو ئاشكراو بیرێكی تیژو كراوەو دڵێكی خۆشو ئاسوودەو هیممەتێكی بەرزبین.

بێگومان ئەمەش سادەو ئاسانو بێبەرنامەو پلانو كاركردن نایەتە دی، گرنگی پلان لەوەدایە كە ڕوئیاو پەیامو ئامانجمان لە ژیان ڕووندەكاتەوەو هەماهەنگی بە ئەنجامگەیاندنی تەواوی كارەكانمان دەكاتو ڕێكخستنو پێشخستنیان بە گوێرەی پێویستییەكانو كۆنترۆڵكردنو دەستبەسەراگرتنی گرفتەكانی ڕێگای جێبەجێكردن ئاسان دەكات.

بۆئەوەی پەیژەی ژیانمان بە دیواری هەڵەوە نەنێینو خەرمان سوتاوو ڕەنج بەخەسارو دەسخەڕۆنەبینو هەوڵو ماندوبوونمان بەزایە نەڕوات، پێویستمان بە پرۆسەی پلانسازییە بۆ ژیانمان كە چالاكییەكە دەمانگوازێتەوە لە بارودۆخی ئێستامانەوە بەرەو ئەو شتەی خوازیارینو دەمانەوێت پێی بگەین لە ڕێگەی نەخشەو بەرنامەیەكی ڕێكوگونجاو كە پێكدێت لە دیاریكردنی بارودۆخی ئێستا، دیاریكردنی ئامانج، ڕێكخستنی كارەكان. كەواتە ئێستا لە خۆت بپرسە پەیامم چییە لە ژیاندا؟ بارودۆخی ئێستام چۆنە؟ خاڵە بەهێزو لاوازەكانم چین؟ كامانەن بەهرەو تواناو لێهاتوییەكانم؟ هەلو دەرفەتو بەربەستەكان چین؟

دوای پرۆسەی خۆناسینو دیاریكردنی خاڵی دەستپێكردن پێویستمان بە ئامانجە، كە بریتییە لەو خاڵەی دەتەوێت بۆی بچیتو ئەو كەسایەتییەی لە بیرو هۆشتدایەو دەتەوێت لە ئایندەدا دروستی بكەیت، كە پێویستە ئامانجەكەت بەسوودو گەورەو ڕوونو دیاریكراوو عەمەلی بێتو بگونجێتو بێتەدی، دیاریكردنی ئامانجەكانت وزەو تینت پێدەبەخشنو توانای تێكۆشانو كاركردنو بەرهەمداریت زیاد دەكەن، ئەم وتەیەت بیر دێنمەوە كە دەڵێت: (ئەو مرۆڤەی شتێكی نەبێت لە پێناویدا بمرێت شتێكیشی نییە لەپێناویدا بژی)، بەو مانایەی گەر ژیانت بێ ئامانج بوو، وەك داری بێبەرهەمت لێدێت، گەر لە یاریزانێكی هێرشبەری تۆپی پێ بپرسیت بۆچی هەوڵ دەداتو یاریدەكات؟ دەڵێت: دەمەوێت گۆڵ تۆماربكەم، لەبەرئەوە تەواوی شوتەكانی بەرەو گۆڵ ئاڕاستە دەكات، ئەویش لە پێناوی پاداشتی بردنەوەو بەرزكردنەوەی ئاڵای وڵاتو تیپەكەی.

هەمیشە لە پشت ئامانجەكانەوە كۆمەڵێك پاڵنەر هەیە، كە بۆچی من ئەمەم دەوێت؟ ئەم مۆتیڤو پاڵنەرانە لەگەڵ ئامانجەكەتدا بنووسە، تاهەركاتێك لە هەوڵدان خاوبوویتەوە، بیانخوێنیتەوەو وزەو چالاكیو گەرموگوڕیت بۆ بگەڕێتەوەو ئاستەنگو لەمپەرەكانی ڕێگە تێپەڕێنیت.

دەبێت هەرساتێك چاودێری بەرێوەچوونی نەخشەو پلانی تەمەنمان بین تاكارەكانمان لەگەڵ پەیامو ئامانجەكانماندا بگونجێتو هەمیشە هەنگاو هەڵبگرین تانزیكتر بینەوە لە خواستەكانمانو پلانی ڕۆژانەو مانگانەو ساڵانەو دە ساڵی داهاتوومان هەبێتو هەماهەنگو هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ پەیامو ئامانجە سەرەكییەكەمان لە ژیاندا، بۆئەوەی بتوانین كارەكانی خۆمان لە چوارچێوەیەكی ڕێكوپێكدا بەرێوەبەرینو چێژ لە ژیان وەربگرینو بەسوودبینو دووربین لەسەرلێشێواویو كارەكانمان تەواوكەری یەكتربنو بەردەوام بە نەخشەو پلانەكەماندا بچینەوە، تا بزانین چەندێكمان لێ جێبەجێكردووەو بەردەوام گەشەی پێ بدەینو بەهێزی بكەینو كەموكورتییەكانی چاك بكەینەوە، با هەمیشە لە بیرمان بێت، پەروەردگار ئەم گەردوونەی بە ڕێكوپێكی دروستكردووە، بۆیە دەبێت ئێمەش بۆ ژیان نەخشەو پلانی دروستمان هەبێت.

# ئافرەتی سەرکەوتوو کێیەو چۆنە؟



شادییە بابەکر

ئافرەت جوانترینو ناسکترین دروستکراوی خوای میهرەبانە، کە سەرچاوەی سۆزو میهروخۆشەویستییە بۆ ژیان، گرنگترینو گەورەترین ئەرکی بریتییە لە دایکایەتیو بەخشینی خۆشەویستی بۆچواردەورەکەیو کردنەوەی ئامێزی میهرەبانی بۆ بەختەوەرکردنی دەوروبەریو خێزانەکەی، بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، ژیانی مرۆڤایەتی گۆڕانی گرنگو بەپەلە بەخۆیەوە دەبینێتو ئەم گۆڕانە تاڕادەیەکی زۆر کاری کردووەتە سەر ژیانی ئافرەتانی دونیاو ئەرکی سەرشانمانی قورسترکردووە، دەبێت لە یەککاتدا چەندین ئەرك ڕاپەڕێنین.

ئێمە لە ژیاندا ئەرکی گەورەمان لە ئەستۆدایەو دەبێت ئەم ژیانە جوانە بکەینە بەهەشتی سەر زەویو لەم بەهەشتەوە ڕێگەی بەهەشتی هەمیشەیی بەدەست بێنین، چونکە ژیان گەر گەورەو بە نرخ نەبووایە، خوای گەورە ئەم گەردونە گەورەو ڕازاوەو سەرنجڕاکێشەی دروست نەدەکردو ئێمەی مرۆڤی نەدەکردە جێنشینی خۆی. ژیان جوانە، با بە جوانی لە ژیان بڕوانینو خەمو ئازارەکانی تێپەڕێنینو بەسەر کۆسپو تەگەرەکاندا زاڵبینو کارو ئەرکەکانمان تێکەڵ نەکەین، ئەوەش بە هۆی دانانی بەرنامەو پلان بۆ ژیانمان، چوار لایەنی گرنگ هەیە کە پێویستە ئێمەی ئافرەتان تێیدا سەرکەوتوو بین، هەرکات توانیمان لەم چوار لایەنەدا هاوسەنگی ڕابگرین، ئەوا سەرکەوتوو بەختەوەر دەبین.

**یەکەم: لایەنی ڕۆحی:** لایەنێکی زۆر گرنگو گەورەیە، بەڵام بەداخەوە زۆربەمان فەرامۆشمان کردووەو مافی خۆیمان نەداوەتێ، گەر لایانی ڕۆحیمان باش نەبێت چۆن دەتوانین سەرکەوتوو ئارام بین؟ گەر لایەنی ڕۆحیمان فەرامۆش بکەین چۆن دەتوانین سۆزو خۆشەویستی بەچواردەورەکەمان ببەخشین؟ بۆیە زۆر گرنگە لایەنی ڕۆحیمان زۆر ئارامو ئاسوودە بێت، ئەویش بە پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ دروستکاری ئەم گەردوونەو زەویو ئاسمانەکان، دەبێت ئافرەتی سەرکەوتوو خۆی خۆشبووێتو ڕێزونرخی خۆی بزانێت، ئەمە بەو مانایە نییە لە خۆباییو لوتبەرزبین، بەڵکو بەو مانایەی لە خۆشەویستی خۆمانەوە ژیان جوان بکەین، هەمیشە متمانەمان بە وزەو تواناکانی خۆمان هەبێت.

**دووەم: لایەنی خێزانیو هاوسەرداری:** هەموومان لە هەوڵی دروستکردنی خێزانو ژیانێکی بەختەوەردایــن، بەڵام لەگەڵ چوونە ناو ئەم ژیانەوە، زۆر بەشو لایەنی گرنگی فەرامۆش دەکەینو پەیوەندی لەگەڵ هاوسەرو پەروەردەکردنی منداڵو ژیان بەڕێوەبردن، بەرپرسیارێتییەکی گەورەو ئەرکی سەرشانی هەمووانەو خوای گەورە بۆی دیاریکردووین. ئافرەتی سەرکەوتوو ئەرکو مافی هاوسەرو پەروەردەکردنی منداڵەکانی ناگۆڕێتەوە بە تەواوی دونیا، ئەم لایەنە لایەنی بەختەوەریو ئارامی هەمیشەیی ژیانی هەموو مرۆڤەکانە، ئافرەتی سەرکەوتوو هەر ناوو پێگەیەکی هەبێت لە لای خێزانەکەی کەسێکی سادەیە، خەریکی بەراوردی خۆیو هاوسەری نابێتو ئەرکی دایکایەتی لە بیرناکاتو خۆی هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانی ژیانی خۆی دەدات.

**سێیەم: لایەنی ڕووخسار پاكو خاوێنیو تەندروستی:** سوپاس بۆخوا ئافرەتانی ئێمە لەم لایەنەوە تاڕادەیەك باشین، گرنگیمان پێداوە، بە تایبەتی ڕووخسارو جوانی دەرەوە، کە ئەمەش شتێکی باشە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە، کەیو لە کوێو چۆن گرنگی پێدەدەین؟! لایەنی باری تەندروستی پێویستە زۆر لە بەرچاوبگرین، لەبەرئەوەی بیرو ئەقڵی ساغو ڕۆشن لە جەستەی تەندروستو ساغدایە، ئافرەت دروستکراوێکی ناسکە، دەبێت زۆرباش ئەم ناسکییەی خۆی بپارێزێتو گرنگی پێبدات.

**چوارەم: لایەنی کارو ئەرکی دەرەوە:** ڕوونو ئاشکرایە ئەمڕۆ ئافرەت لە هەموو کایەکانی کۆمەڵگادا، ڕۆڵدەگێڕێتو ئەرکو فەرمانی دەرەوەی ماڵیشی لە ئەستۆ گرتووەو خزمەتی وڵاتو نیشتیمانی خۆی دەکات، ئافرەتی سەرکەوتوو لە بواری کاردا دەبێت مافی تەواو بدات بە کارەکەی، بە دڵسۆزیو ئیخلاسەوە ئەرکەکەی جێبەجێ بکات، ڕەچاوی ئەوەش بکات کە هەموو ژیانو لایەنەکانی تر نەکاتە قوربانی کارو پیشەکەی، چونکە بەداخەوە ڕێژەیەکی زۆر لە کچانو ئافرەتان کاری دەرەوە وای لێکردوون، هەموو لایەنەکانی تریان فەرامۆشکردووەو نانێکی گەرم بە دەستی خۆیان ناخۆنو بۆ ساتێك لەگەڵ منداڵەکانیان دانانیشنو لە ئامێزی پڕ میهری خۆیان بێبەشیانکردوونو لایەنی پەروەردەکردنیان فەرامۆشکردوون، پێویستە لەم خاڵەدا زۆر وردو ئاگادار بین، لە کۆتاییدا دەمەوێت بڵێم: هەموو ئافرەتێك سەرکەوتوو دەبێت ئەگەر خۆی بیەوێت، بۆیە بۆساتێکیش بێت دەبێت بیر لە خۆی بکاتەوەو بزانێت ئەو کێیە؟ ئەرکی چییە؟ بە هاوسەنگی ڕاگرتنی ئەم چوار لایەنە، دەبیتە ئافرەتێکی بەختەوەرو سەرکەوتوو دڵخۆش، کۆمەڵگاش کۆمەڵگایەکی سەرکەوتوو پێشکەوتوو دەبێت.





و: کاروان ئەحمەد




گومانـــی تێدانییـــە، ئێمـــە هەمووومـــان دەمانەوێت لە خۆمان دڵنیا بین، یان بڕوامان بە خۆمان هەبێت، لە کاروباری ڕۆژانەماندا، بەڵام چی ڕوودەدات ئەگەر بڕوا بەخۆبوونت کەم بـــوو، یان هەر بڕوات بەخۆت نەبوو لە ژیانتدا؟ بزانە کە هەســـتی بڕوا بەخۆبوون شـــتێك نییە لـــە چاوتروکانێکدا بەدەســـتی بهێنیـــت، بەڵکو دەبێـــت کاتێکی بۆ تەرخان بکەیت، هەتاوەکو بیسەلمێنیت کە تۆ کەسێکی باشیتو شایەنی ڕێزوو خۆشەویستیت.

**چەند ڕێگایەك بۆ بەدەســـتهێنانی بڕوا بەخۆبوون:**

**١- نائارامـــیو نیگەرانیـــت دیـــاری بکە:** جڵەوت بدەرە دەست بیروهۆشت، بزانە چی دەڵێت؟ چی وات لێدەکات کە شەرم لە خۆت بکەیـــت؟ شـــەرمکردنت بە هـــۆی ئەوەوەیە کـــە هەژاریـــت، ڕووخســـارت ناشـــیرینە؟ یان بـــە شـــێوازێکی نەرێنـــی جیاوازیت لە هاوڕێکانت؟ هەرشـــتێك وات لێدەکات هەست بـــە ناشایســـتەیی، یان شـــەرم، یاخـــود کەم بەهایی بکەیت، ئەوا دەستبەجێ دیاری بکە، یان لەسەر کاغەزێك بینوسەرەوە، دەتوانیت دوای ئەنجامدانـــی ئـــەم کارە دەســـتبەجێ کاغەزەکە بدڕێنیت، بۆئەوەی ئەو نوسراوانە لە مێشکتدا نەمێنێتەوە، پاشان بەشێوەیەکی گەشبینانە بیربکەرەوە.

**٢- باســـکردنی کێشـــەکانت، بـــۆ هاوڕێ خۆشەویســـتەکانت:** وەکو بازنگ لە باسکیان بکـــە، هەمـــوو ڕۆژێك ئەو بازنگە بشـــکێنە، بـــەو واتایەی کە بە ویســـتی خـــوای گەورە لەو کێشانە ڕزگارت دەبێت. زیاتر جەختیان لەسەر بکەرەوەو پێویستی بکە لەسەر خۆت کە دەبێت چارەســـەریان بکەیت، بەبێئەوەی بەســـەرتدا تێپەڕ ببن. ئەمـــەش مانای ئەوە نییە کە دەبێت هەموو ئەو شتانە بسڕیتەوە کە وات لێدەکات هەســـت بە خراپی بکەیت، چونکـــە زۆرجـــار ناتوانیـــت ئـــەوە بکەیت، پێویســـتە فێربیت کە دەبێت خۆت پەسەند بکەیـــت، ڕابـــردووت هەروەها هەمـــوو ئەو بارودۆخانـــەت وەکو خۆیـــان کە هەن، بەبێ بیرکردنەوە لێیان بەشێوەیەکی خراپ.

**٣- لـــە بیرت بێت کە هیچ کەســـێك بێ هەڵەو کەموو کورتی نییە:** ئەوە پەروەردگاری جیهانیانـــە کە بـــێ هەڵـــەو کەمووکورتییە، بـــەڵام تەنانەت ئەو کەســـانەی کە هەســـتی باوەڕبەخۆبوونیان زۆرە، هێشتاش بێ هەڵەو کەموکورتـــی نین. گومانـــی تێدا نییە کە لە ژیانمانـــدا هەندێجار دەبێت هەســـت بکەین شـــتێکمان کەمە. کەواتە فێر ببەو هەســـت بکە کە ژیان پڕە لە تاسەو بەربەست، خۆت ئامادە بکە بۆ تێپەڕبوون لێیان.

**٤- سەرکەوتنەکانت، یان دەسکەوتەکانت دیـــاری بکـــە:** هەموو کەســـێك لە شـــتێکدا ســـەرکەوتووە، کەواتە ئەو شتانە بدۆزەرەوە کە تیایاندا باشیتو ســـەرکەوتوویت، پاشان جەخت بکەرەوە لەســـەر ئەو بەهرانەی کە خوای گەورە پێی بەخشـــیویتو شـــانازییان پێوە بکـــە. دانبنێ بـــە ســـەرکەوتنەکانتدا. کەمتەرخەمـــی بارودۆخێکـــی مێشـــکە، کە تێیـــدا خۆت بە قوربانـــی دەزانیت، ڕێگە بە خۆت مەدە ببیتە قوربانی. خۆت دەربڕە، جا بـــە هۆی هونەرەکانتـــەوە بێت، یان بە هۆی نووســـراوەکانتەوە، یان بە هۆی هەر شتێکی ترەوە بێت. شـــتێك بدۆزەرەوە کە دڵخۆشت دەکات، هەمـــوو کەســـێك لەگـــەڵ کۆمەڵێك بەهرەو تواناردا دێتە دنیاوە کە خوای گەورە پێی بەخشـــیوە، پاشـــان ئێمـــەش دەتوانین گەشەیان پێبدەین.

**٥- سوپاســـگوزار بـــە، بەرامبـــەر ئـــەو شـــتانەی کە پێت بەخشـــراوە:** زۆرجاران کە تۆ لەوپەڕی نائارامیدایتو باوەڕبەخۆبوونت کەمـــە، ئەوا بێگومان هەســـت بـــە نەبوونی شـــتێك دەکەیت، جا ئەوەش نەبوونی سۆزو خۆشەویســـتییە، یـــان بەختێکی بـــاش، یان زۆرجار بە هۆی لاوازی ژیانی ئابووریتەوەیە. بە سوپاسگوزاریو هەڵسەنگاندنو بەهازانینی ئـــەو شـــتانەی پێتبەخشـــراوە، دەتوانیـــت بەرەنـــگاری هەســـتکردن بـــە ناتـــەواویو ناڕازیبـــوون ببیتـــەوە. هەروەهـــا بزانە کە هێمنیو ئارامـــی دەروون، باوەڕبەخۆبوونت زۆر باشو سەرنجڕاکێش دەکات.

**٦- گەشـــبین بە، هەتا ئەگەر هەستیشی پـــێ نەکەیـــت:** دووربە لەوەی کـــە لە خۆڕا خۆت خەمبـــار بکەیت، هەروەهـــا خۆت بە هەستو سۆزو چاکەو خراپەی خەڵکی ترەوە مانـــدوو مەکـــە. هەرگیز ڕێگە بـــە خەڵکی مەدە وات لێبکەن هەســـت بە کەمتەرخەمی بکەیـــت، چونکە دەتوانن ئەگەر ڕێگەیان پێ بدەیـــت. لە بەهـــای خۆت کـــەم مەکەرەوە، بە گەشـــبینانەوە لە بـــارەی خۆتەوە بدوێ، بە گەشـــبینانە سەیری پێشـــکەوتنەکانت و داهاتووت بکە. مەترســـە لە پیشاندانی هێزو ئەدگارەکانتـــدا لـــە بەرچـــاوی خەڵکیدا. بە ئەنجامدانی ئەم کـــردارە، خەونو هیواکانت لە مێشـــکتدا زیاد دەکات، هانی گەشەکردنت دەدەیت بە شێوەیەکی ئەرێنیانە.

**٧-بـــە خۆشـــحاڵیو سوپاســـەوە ڕەخنە وەربگرە:** ئەگەر کەسێك ڕەخنەی لێگرتیت، چاوەکانتـــی لێ بز مەکەرەوە، لە بەرامبەردا بڵـــێ: تۆ ڕاســـت دەکەیـــت، ئەگەرنـــا خۆتی پێـــوە نیگـــەران مەکە. بـــە دڵ وەری بگرەو بە جوانی وەڵامی بدەرەوە، (ســـوپاس بۆ تۆ، خەندەیەکیش باشتر کار دەکات).

**٨- پارمەتی کەسانی تر بدە:** کاتێك هەست دەکەیت کـــە لەگەڵ خەڵکیدا بەخشـــندەیت، هەروەهـــا بـــە دروســـتکردنی جیاوازییەکـــی ئەرێنیانـــە، ئەوا بـــۆت دەردەکەوێـــت کە تۆ هێزێکی کاریگەریت لەم جیهانەدا. هەموو ئەم کردارانەش باوەڕ بە خۆبوونت زیاد دەکات.

لە فارسییەوە: بەنان عەتا

# هاوڕێکانی ئێوە.. کەسایەتی ئێوەن



وتەیەکی ژاپۆنی هەیە دەڵێت: (کاتێك کەسایەتی کەسێکتان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە لە هاوڕێکانی ئەو کەسە بڕوانن‌و بکۆڵنەوە)، هەروەها سەروەری مرۆڤایەتی (پێغەمبەر)(دروودی خوای لەسەربێت) دەفەرموێت: "((هاوڕێ لەسەردینی هاوڕێکەیەتی)، هەروەها ئیسپانییەکانیش دەڵێن: (پێم بڵێ هاوڕێکەت کێیە، تا پێتبڵێم تۆ کێیت)).

کاتێك کە بیر لەم وتانە دەکەینەوە، پێدەچێت هەمان بیرکردنەوەمان هەبێت کە لەسەرەتاوە ئاماژەمان پێکرد، بە دڵنیاییەوە بیرکردنەوەکەتان ڕاستو دروستە، هەروەها ئێوە لە ژینگەیەکدا دەژین‌و گوزەرانی تیادا دەکەن، دەوروبەرەکەتان‌و ئەو کەسانەی لێتانەوە نزیکن زۆر ئامۆژگاریتان دەکەن، لە هەمانکاتدا پێدەچێت گەلێکیش لەوکەسانە لەگەڵ ئەم باسەدا ناکۆکبن‌و هاوڕانەبن، چونکە وادەزانن، ئەمان لە کەسانی تر باشترن‌و بیرکردنەوەیان پۆزەتیڤترە، یاخود دەیانەوێت بڵێن: "کە کاریگەری ڕەفتارو ئاکار، کرداری هیچ کەسێکی تر بۆیان کاریگەر نییە، هەروەها سەرنجڕاکێش نییە، بەڵام لە قۆناغێکی زۆر بێئاگای تەمەن‌و بیرکردنەوەدا زیندەگی دەکەن،چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، نەك مەنتیقی، ئاکارو کرداری کەسانی دیکە کاریگەری دەبێت لەسەرمان. بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە لێمانەوە نزیکن، هەروەها کاریگەری کاتێك ڕوودەدات، دونیای ئەو کەسانەی کە تیایدا دەژین، هەمان دونیا بۆ خۆمان بخوڵقێنین‌و دووبارەی بکەینەوە، وەك (هاوڕێ، هونەرمەند، ئەکتەری نواندن، کەسایەتییە ناودارەکان ......هتد).

هەر بۆیە ئەگەر دەتانەوێت کەسایەتی خۆتان هەڵبسەنگێنن‌و پێوانەی بکەن؟" ئەوا لە دەوروبەرەکەتان بڕوانن، هەروەها لەخۆتان بپرسن: ئایا ئەوان خۆشحاڵن؟ ناڕازین لە ژیانیان، دڵپاکن، بوغزاوی‌و کیناوین، ڕەشبین‌و بێئومێدن؟" بەڵام لە پێوانەکردن‌و بەراوردکردنی ژیانی خۆتان لەگەڵ ئەواندا ڕاستگۆبن، ئەگەر ئەوان کەسانێکی خەم ئامێزبوون، زۆربەی کاتەکانیان بە دڵتەنگی‌و ڕاڕایی‌و دڵەڕاوکێوە دەگوزەرێنن، لە هەمانکاتدا هاریکاری ئێوەشیان قبوڵ نییە، هەروەها بە هەمیشەیی‌و بەردەوامی گلەیی‌و گازندە دەکەن، لەو بارودۆخەی کە ئەو دۆخەی بۆ سازاندوون، ئینجا هەوڵ‌و کۆششیش دەکەن بۆ گۆڕینی ئەو دۆخەی کە تێی کەوتوون. بەڵام متمانەو ئیرادەیان بە خۆیان نییە بۆ ڕزگاربوون لەو بارودۆخە، ئەو کات هەموو شتێکتان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

ئێمە ناڵێین: "لە پاش خوێندنەوەی ئەم بابەتە بڕۆنە دەرەوە لە ماڵەوەو هەموو هاوڕێکانتان وەلابنێن، بەڵکو بە پێچەوانەوە بازنەی هاوڕێیەتییەکەتان فراوانبکەن‌و کەسێکی کۆمەڵایەتی بن، کەسایەتییەکی ئاکتیڤو چالاك بن، لە زۆربەی کۆڕو سیمینارەکاندا بەشداری بکەن‌و ئاستی زانستو زانیاریتان گەشە پێبدەن. با هەمیشە وەفاداری‌و ئارامبەخشی لە کردارو گوفتاردا شەپۆل بدات، ئەو کاتانەی لەگەڵ هاوڕێکانتدا دەگوزەرێنیت هەوڵبدە ئامۆژگارییان بکەیتو ڕێگای جوانیان پیشان بدەیت، بە بێئەوەی هەستیان بریندار بکەیت.

ئینجا هەوڵ بدە، بزانیت هاوڕێ نزیکەکانت، خاوەنی چ جۆرە کەسایەتییەکن؟ "کەسایەتی ئەرێنی، یاخود نەرێنی، ئەگەر کەسایەتییەکی ئەرێنی بوون، ئەو کات زیاتر هاوڕێیەتی لەگەڵدا تۆخ بکەرەوە، ئەگەریش نەرێنی بوون، کۆشش بکە بۆئەوەی چاکسازی بکەیت لە هەڵسوکەوتیدا، ئەگەر نەتتوانی چاکسازی تیادابکەیت، ئەو کات لێی جودا ببەرەوە، ڕاستە سەختە جیابوونەوە لە هاوڕێ، بەڵام سەختتر لەوە ئەوەیە کەسایەتی خۆمان نەناسین.

هەر بۆیە لەوگۆڕانکارییانە مەترسن کە بڕیارتان لەسەر داوە، چونکە گۆڕانکاری زۆرجار خراپ نییە، بەڵکو سودو قازانجی زۆرترە، بۆیە هەمیشە پێویستە لە خۆتان بپرسن: ئایا ئەو کەسانەی کە هەڵتان بژاردووە کەسانێکن دەتوانن بە هەستی بەرپرسیارێتییەوە هاوڕێیی ئێوە بن؟ ئایا ئەوان بە بینینی پەرداخە نیوە ئاوەکەی ئێوە، ئێوە بێئومێد دەکەن؟ یاخود بیرۆکەی لۆژیکی‌و مەنتیقی بە ئێوە دەبەخشن؟ بۆئەوەی کەمترین هەڵەبکەیت لە ژیانتدا، یان تەنها بۆ گوزەرانی کاتو ڕۆژ بووەتە هاوڕێت؟

کلمنت ئاستون دەڵێت: "(ئێوە بەشێکن لە دەوروبەرتان، هەر بۆیە ئەو بەشەی دەوروبەرتان بە شێوازێك هەڵبژێرن کە ڕایەڵەی ئێوە بن بۆ ئەوەی بگەن بەو ئامانج‌و خولیایانەی کە لە مێشکتاندا نەخشەتان بۆ کێشاوە).

ئایا ئەو کەسانەی کە وەك هاوڕێ، هۆکاری هاتنەدی خەونەکانتانن؟"یان بە پێچەوانەوە ڕێگرن لە بەردەمتاندا؟

لە کۆتاییدا هەر ئەوە ماوە بڵێین: کە هەمیشەو هەردەم بە ئامانجەوە بژین، هەروەها لە هەڵبژاردنی هاوڕێدا وریابن.

سەرچاوە گۆڤاری: راه موفقیت.

# گومانبردن

## بەشی سێیەم



پەیمان غەمگین

لە درێژەی بابەتەكەمدا، باسی ئەوەمان كرد كە گومان لە هەستەكانەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵگەشمان ئەو لێكدانەوانە بوو، كە بەشێوەیەكی پراكتیكی خستمانە ڕوو. زۆرێكمان بڕوامان بەوە پتەوە، كە خاڵە لاوازەكانمان لە هەستەوەیە، دانیشمان بەوەدا ناوە، كە سەركەوتن بەسەر گەورەترین هێز، دەستگرتنە بەسەر خاڵە لاوازەكەی ئەو هێزە.

كەواتە، دەستەبەری ئەوەمان هەیە، كە ئەگەر هێزێك، چەندە هێزداربێت، شكست پێهێنانی لە خاڵێكەوەیە، كە درك كردن بەو خاڵە زۆر ئەستەمە، هەر بۆیەش دەگەینەوە هەمان سەرەداو، كە پێمان وابوو سەرهەڵدانی گومان لە هەستەوەیە. زۆرێك لە توێژینەوەكان هۆكاری گومان دەگەڕێننەوە سەر خۆشویستنێكی لە ڕادەبەدەر، لەوێوە ناوی دەنێن ئیرەیی، بەڵام من ئەو دوو تەوەرە تێكەڵ بە یەك ناكەم، چونكە هەموو گومانێك ئیرەیی نییە، بە پێچەوانەشەوە هەموو ئیرەییەكیش گومان نییە، كەواتە بۆچی دەبێت پێچەوانەكەی پێچەوانەیی نەبێت. لەمەوە هەلی تێگەیشتن ئاسانترە بۆ ئەم لێكدانەوە قورسانە، هەندێجار گومانبردن لە ئیرەییەوەیە، ئیرەییەكەش لە خۆشەویستییەوە، خۆشەویستیش لە هەستەوە. هەندێجاریش گومانبردن لەو دیو بیركردنەوەكانەوەیە، ئەمانیش لە كاتێكدا كە نەتوانرابێت شیبكرێنەوە، كاتی لێكدانەوەكانیان كامڵو گەیوو نەبووبێت، بەڵام ئەمانیش هەر لە هەستەوە سەرچاوەیان گرتووە، جیانابنەوە، چونكە لە ڕێگای هەستەوە دركی پێكراوە، بۆیە نەتوانراوە لە لێكدانەوەكانی فیكری كامڵی وەرگرێت، دوای بۆتە گومانێكی ڕەها، كە توانجەكانی بە دامەزراوەیی هێشتوونەتەوە بەسەر پەراوێزەكانی لێكچوون.

چیمان دەستكەوت؟؟

لە هەموو ئەو لێكدانەوانەماندا، سێ خاڵی گرنگ هەیە:

یەكەم: دەستگرتن بەسەر خاڵی لاوازی ئەو هێزەی تر، بە هەموو هێزەكەیەوە ناتوانێت لە بەرگریدا بمێنێتەوە.

دووەم: گومان دەتوانرێت ئیرەیی بێو بە پێچەوانەشەوە ئیرەیی نییە.

سێیەم: دەكرێت گومان لەودیو بیركردنەوەكانەوە بێت. لە كاتێكدا كە نە توانرابێت شیبكرێتەوە، كە خاڵێكی ڕەهایە بۆلێكدانەوەكانمان.

لێرەدا دێینە سەر لێكدانەوەیەكی گشتگیر، بۆ هەموو باسەكەمان، دوایش دەرخستنی هەموو ئەو خاڵانەی كە دەرەنجامەكان دەخاتەوە باوەشی لێكدانەوەیەكی پانتاگیر لە هەموو ڕوانگەیەكی گومانەكانەوە. با لە خاڵی یەكەمەوە دەست پێبكەین، (دەستگرتن بەسەر خاڵی لاواز)، مەبەستی سەرەكیم لەو خاڵە، هەڵڕشتنی باسێكی وردە، سەبارەت بە تواناكانی سایكۆییو بابەتیو ئایدیای مرۆڤەكان، تا لە تەكییەوە درك بەوە بكرێت كە مرۆڤ چەندە هێزدارە سەبارەت بەو هێرشەی كە كراوەتە سەری لە لایەن گومانەوە.

ئایا بۆچی گومان وازوو پەلكێشت دەكات؟ بۆچی بە زوویی داگیرمان دەكات؟ هۆكاری چییە كە هەموومان لاوازین، لە بەرامبەر گوماندا؟ ئایا ئەمە مانای ئەوەیە هەموومان بێهێزین؟ نەخێر، هەموومان هێزی تایبەت بە خۆمان هەیە. هەم ئایدیاو هەمیش سایكۆییو دواییش بە بیروباوەڕەوە، بەڵام خاڵێكی لاواز لە هەموو هێزێكدا هەیە، ئەگەر سەیری جامەكان بكەن ئەوانەی زۆرانبازو ئەوانەی لە مێژووەوە باسی لێوەدەكرێت، دوایش ئەوانەی بە ئەفسانە دەگێڕدرێنەوە، هەموو ئەو هێزە پەلكێشانە، لە خاڵێكی لاوازەوە شكستیان خواردووە، ئێمەش لە بەرامبەر ئەو هێزەی گومان، لە خاڵی لاوازەوە دەست بە ئەژنۆین، ئەو خاڵە لاوازەش لە هەستمانەوەیە، هەر بۆیەش زۆرینەی گومانەكانمان كە لە خێزانیو هاوڕێیو بازرگانیو... هتد، بە گشتی هەموویان سۆزدارین، واتا هەموو ئەو گومانانە لە هەستەوەیە بۆ زۆرینەشیان، گومانی خراپە. واتا گومان هێرشەكانی چڕدەكاتەوە لە هەستەوە هێرش دەكات، ناهێڵێت بیركردنەوە بەو هێرشە بزانێت، تاكو نەتوانێت بەرگری بكات، چونكە خاڵی هێزدار لە مرۆڤ عەقڵە، خاڵە لاوازەكەشی بۆ تێكشكانیش هەستە.

خاڵـی دووەم: (گومان دەتوانێت ئیرەیی بـێو بە پێچەوانەشـەوە ئیرەیـی نەبێت)، واتا، هەموو ئەو گومانانە دەتوانرێت دابەش ببـن، بـە پێی ئـەو وەزیفانەی کـە مرۆڤ هەیەتـی، بەشـێکی گـەورەی وەزیفەکانـی ئەمیـش پابەنـدو بەسـتراون بـە ژیانـی خێزانییەوە، هەر ئـەوە ناگرێتەوە کە باس لە ژنو مێردێك بکەین، بەڵکو مەبەسـتمان خێزانێکـی گەورەیـە، کەواتـە ئیرەیـش بەشـێك دەبێت لـە داهاتەکانی گومان، هەر چەندە ئەوە باسـێکی گەلەك لەوە گەورەتر لەخۆدەگرێـت، زۆر لەوەگەورەترە کە من لە بابەتێکـی واکورتدا هەڵیرێژم، دەتوانم بڵێم گومان لە ئیرەییەوە سـەرچاوە دەگرێت، بە پێچەوانەشەوە دەتوانم بڵێم گومان ئیرەیی نییە، واتا لە سەرێکەوە ئەگەر گومانەکان لە نێو خێزانێـك کۆبکەینەوە دەکرێت ئیرەیی بێـت، ئیرەیش لە خۆشەویسـتی زۆرەوەیە، بـە واتایەکی تر دەکرێت لـە نێو خێزانێك گومان بە هۆی ئیرەییەوە بێت، لەبەرئەوەی خۆشەویستی سەروەرە، دەکرێت ئەم گومانە تەنها پەیوەندیداربێت بە سۆزەوە. بەشەکەی تـر لـە دەرەوەی خێزاندایـە، واتـا لە نێو هەرلایەنێـك دوور لە خێزانـەکان، دەکرێت ئەو گومانە ئیرەیی نەبێت، بۆ نموونە باوك لەگـەڵ کوڕ لەسـەر کردەوەکانی، خۆ ئەمە هیچ پەیوەندی بە باری سـۆزدارییەوە نییە، بۆیـە دەبێت بـە جوانی لـەو جیاکارییانە بگەین، تاکو بە شـێوەیەکی ڕوون لە هەموو ماناکانـی گومان بگەین، تاکو تووشـی هیچ هەڵەیەکی ناوەخت نەبین.

خاڵی سـێیەم: دەکرێـت گومان لەو دیو بیرکردنەوەکانـەوە بێـت، واتـا نزیکە ئەو گومانەی کە درووستبووە، هۆکارەکەی پابەند نەبێت بەو خاڵانەی کە باسمان کرد، ئەمەش ئـەوە دەگەیەنێـت کە گومانـەکان لە کاتی هێرشـەکانیان لە پەنای بیرکردنەوەکانەوە خۆیـان مـەڵاس دەدەن، تـا دەگات بـەوەی خـاوەن بیـر نەتوانێت هەسـت بە بوونو جوڵەیان بکات، ئەمانیش زیاتر ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بەپەلە بڕیار دەدەن.

دەرەنجـام: گومـان دەکرێـت هۆکارێك بێت بۆ دەرخسـتنی ڕاستییەکان، بەڵام لە چ کاتێکدا؟ لەو کاتەی کە ڕاسـتییەکانت بینی، نـەك ئـەوەی دوورەپەرێـز بڕیـار بدەیت، لەمـەوە فێردەبین کە هەر بڕیارێك دەکرێت گومانی تیابێت، بەڵام ناکرێت هەمووی گومان بێت، ئەگەر هەر بڕیارێکیش بە گومانەوە لە دایکبـوو، ناکرێت نـاوی بنرێت بڕیار، بەڵکو دەبێت دووبارە هاوسـەنگی بکرێت لە نێوان خەیاڵـەکان تاکـو بڕیارێـك لە دایـك بێت، بـە بەڵگەوەو بـە بێگومان، بسـەلمێنێت کە بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە، نەك گوماناویی.




ژیان فێری کردم: تاکە ڕێگە بۆئەوەی بزانم تا کوێ دەتوانم بڕۆم، ئەوەیە کە تا ئەوپەڕی ڕێگە بڕۆم!

ژیـان فێـری کـردم: حەماسـەتو گەرموگـوڕی، باشـترین توانـا بـۆ جێبەجێکردنـی کارەکانـت دابین دەکات، بەبـێ حەماسـەتو گەرموگـوڕی، هیـچ کارێکـی گەورەو گرنگ، یان سـەرکەوتوو، ئەنجام نادرێت، کەواتە پێویستە لە هەموو کارەکانتدا حەماسـەتت هەبێـت، هاوکات نابێت گڕی تاسـەیەکی کـورت کە لە پڕ دێتو دەڕوات، لەگەڵ حەماسەتێکدا تێکەڵ بکەیت، کە ڕووناکییەکەی بەردەوامە!

ژیان فێری کردم: پێویسـتە تواناکانی خۆت بەهێز بکەیـت، بەتایبەت ڕێزگرتن لە خـودو بەهابـەرزەکان، چالاکییەکانت ئاڕاسـتە بکە بـۆ کاری بەسـوودو نایاب، لەسـەر ئەم بنەمایەش ڕێگەکەت ڕاسـت بکەرەوە.

ژیان فێری کـردم: لە کاتی هەوڵدانی بێ وچانتدا بۆ گەیشـتن بە ئامانجەکانت، دەبینیت بەربەسـتەکان ڕێگەت پێدەگرن، لەو کاتەدا بەردەوامیو بێ وچانی مێروولەت بێتەوە یاد، کە چۆن بەربەستەکان ناتوانن ڕێگەی بەرەو ئامانجەکان پێ بگۆڕن..

ژیـان فێری کـردم: ئەگـەر ئامانجت بریتی بوو لە پەرەپێدانی ماسولکەو هێزو بازووت، یان ژیریو عەقڵت، ئەوا ڕاهێنانو پیادەکـردن بـە شـێوەیەکی بـەردەوامو ڕێكوپێك لەسـەر کـرداری بەهێزکردنی ماسـولکەو ژیریت، دەتوانن بتگەیەنن بەو ئامانجەی ئاواتی بۆ دەخوازیت!

ژیـان فێری کـردم: وادابنێ مێشـکت بریتییە لە وێسـتگەیەکی بەرهەمهێنانی کارەبـا لە شـارێکی گـەورەدا، ئایـا ئەو وێسـتگەیە پێویسـتی بـە ئەندازیارێکی زیرەكو لێهاتوو نییە؟

ژیـری ناوەکیـت ئـەو ئەندازیارەیە، دڵنیابـە لـەوەی مێشـکت دەتوانێـت بە باشترین شـێوە چاودێری ژیری ناوەکیت بکات، ئەگەر خۆت هەوڵی بۆ بدەیت!

ژیان فێری کردم: توانای کارکردن تەنها بە کارکردن بە دەسـت دێت، کەواتە تەنها بیر لەو کارە بکەرەوە کە لەبەردەستتدایە، بۆئەوەی بە هەموو تواناو گرنگیدانێکتەوە ئاڕاستەی خۆت بکەیتە ئەو کارە.

ژیان فێری کردم: پێویستە نەرمونیانیو توندو تۆڵی پێکەوە گرێ بدەیت، توندوتۆڵ بە، بۆئـەوەی لە ئامانجەکانت پاشەکشـە نەکەیت، نەرمو نیان بە، تا بتوانیت لەگەڵ بارودۆخـدا بگونجێیت، خۆت لە پێکادانی بەربەستەکان بپارێزە.

ژیان فێری کردم: لە کاتی بەرپاکردنی جەنگدا، وامەزانە کە بۆ زاڵبوون بەسـەر ڕکابەرەکەتدا پێویستە لەو بەهێزتر بیت، سەیری ڕاهێنەری دڕندەکان بکە، دەبینیت ڕاهێنەرەکـە لە ئاژەڵە دڕندەکە بەهێز تر نییە، بەڵام زاڵە بەسەریدا!



# هاوڕێییەکی دەگمەن!

ئا: ئالانی

دوو لاو ئەوەندە یەکتریان خۆشدەویست، کە ناتوانین بە نووسین وێنای بکەین، خۆشەویستی ئەوان، بە وێنەی هیچ کەس نەبوو..

ئەم دوو لاوە ئەوەندە هۆگری یەکتریبوون، تا ئەندازەی مەرگ، ئەوان هەمیشە پێکەوە دەڕۆیشتن بۆ گەشتوگوزار، پێکەوە کاتەکانی بەتاڵییان لە نێو پارکەکاندا بە وێنەی دووکەس کە زۆر لە مێژە یەکتریان نەبینیووە، بەسەردەبرد، جگە لەوەی کارەکانیان پێکەوە بوو، لە دەرەوەی کاریش کاتەکانیان پێکەوە بەڕێدەکرد، ئەوان لە نێو ئەوپەڕی خۆشەویستیدا ژیانیان دەگوزەراند، تەنانەت بۆ یەکجاریش لە یەکتر زیز نەببوون، پێکەوە بوونو خۆشەویستیان بۆ یەکتری گەیشتبووە ئاستێك کە تەنها بۆ خەوتن لە یەکدی جیادەبوونەوە.

ئەوان هەمیشە لە نێو دیمەنی جوانو دڵڕفێنی باخچەکاندا، وێنەی فۆتۆگرافیان دەگرت، تاوەك یادگارییەك لایان بمێنێتەوە. ئەم دوو لاوە پێکەوە لە تاقیگەی وێنەگرتن کاریان دەکرد..

ڕۆژێکیان کوڕە لاوەکە ڕۆیشت بۆ سەرکار، بۆ شۆرینەوەی هەندێك وێنە، کاتێك کاری شۆرینەوەی وێنەکانی تەواو کرد، پێش ئەوەی شوێنی کارەکەی جێبهێڵێت، هەموو شتەکانی ڕێکخستو لە شوێنی کەلوپەلەکانی لە جێگەی تایبەتی خۆیاندا دانان، هەر لە پەڕاوو ماددەی کیمیایی تایبەت بە شۆرینەوەی وێنەکان، چونکە ئەو ڕۆژە هاوڕێکەی نەهاتبوو، لەبەرئەوەی مەوعیدی بۆ چاوپێکەوتنی دایکی هەبوو..

بۆ ڕۆژی دواتر، ئەمیان زووتر لە ڕۆژان ڕۆیشت بۆ سەر کارەکەی، بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی، سەرەتا دەستیکرد بە شۆرینەوەی وێنەکان، بەڵام هاوڕێکەی ڕۆژی پێشوو ترشی مادده کیمیاوییەکەی بە هەڵە دانابوو، ئەوەی نەدەبوو ڕووبدات، ڕوویدا، لەو کاتەدا کە سەرقاڵی کارکردن بوو، سەری بەرز کردەوە بۆئەوەی هەندێك ماددەی کیمیایی هەڵگرێت، لە ناکاو ماددەکەکە ڕژا بەسەر دەمووچاویو ڕووخساریدا، هاوارو قیژەی ئەم لاوە هەموو کارمەندانی کارگەکەی بە ئاگا هێناو هەمووان بە هەڵەداوان بۆلای ئەو ڕۆیشتن، کاتێك بینیان حاڵەتەکەی زۆر ترسناکە، زۆر بە خێرایی گواستیانەوە بۆ نەخۆشخانە، لەو کاتەدا هاوڕێکەی گەیشتە کارگە،

هەندێك لە هاوڕێكانی كە لەسەر كار مابوونەوە بە پەشۆكاوییەوە هەواڵەكەیان پێگەیاند!!

ئەویش باش دەیزانی كە ئەو ترشە چەندە ترسناكە كە ڕژاوە بەسەر ڕووخساری هاوڕێكەیدا، دڵنیابوو لەوەی كە دەبێتە هۆی لە دەستدانی چاوەكانیو شێواندنی ڕووخساری، دەیزانی چی ڕوودەدات!!

هەربۆیە سەرجەم ئەو وێنانەی كە پێكەوە بۆ یادگاری گرتبوویانن دڕاندنیو زۆر بە خێرایی كارگەكەی بەجێهێشتو ڕۆیشت، هاوڕێكانی دیكەی بەم دیمەنە پەشۆكابوونو نەیاندەزانی ئەم مامەڵە دڵڕەقانە بۆ؟ لە بری ئەوەی بە گریانەوە بڕوات بۆ لای هاوڕێ گیانی بە گیانییەكەی، ئێستا كە دەزانێت هاوڕێكەی چاوەكانی لە دەست دەدات، وێنەكانی ڕۆژانی ڕابردوویان دەدڕێنێتو كارگەكە جێدەهێڵێت!!

دوای چەند ڕۆژێك هاوڕێكانی دیكەی كارگە جگە لە هاوڕێ زۆر ئەزیزو گیانی بەگیانییەكەی نەبێت، كە لە ڕۆژی ڕووداوەكە بە دواوە تەنانەت كارگەكەشی جێهێشتبوو، كەس نەیدەزانی بۆ كوێ ڕۆیشتووە، ئەوانی دیكە بۆ هەواڵپرسینی هاوكارەكەیان سەردانی نەخۆشخانەیان كرد تا هەواڵی تەندروستی هاوڕێكەیان بپرسن، كاتێك گەیشتنە نەخۆشخانە هەمووان تووشی سەرسوڕمان بوو، چونكە وەك ئەوەی ئەوان چاوەڕێیان دەكرد وا دەرنەچوو، بینیان چاوەكانی چاكبووەتەوە هیچ زیانێكی پێنەگەیشتووە، تەنها كەمێك ڕووخساری شێوا بوو، ئەویش دكتۆری جوانكاری بەڵێنی دابوو كە بە نەشتەرگەرییەك ڕووخساری بگەڕێنێتەوە بۆ باری ئاسایی خۆی.. بەم دیمەنە یەكجار دڵخۆشبوون.

بەڵام تەنها خەمی ئەم لاوە ئەو هاوڕێیەی بوو كە بەردەوام پێكەوە بوونو زۆر هۆگری یەكتریبوون، ئێستا بۆ تەنها جارێكیش هەواڵی نەپرسیووە!

ڕۆژان هاتو ڕۆیشت، ئەم لاوە بە تەواوی چاكبووەوەو لە نەخۆشخانە چووە دەرەوە، دوای چاكبوونەوەی گەڕایەوە بۆ سەر كارەكەی، سەیرێكی ژووری كاركردنەكەی كردو بینی هیچ كام لە وێنەكان لەوێ نەمابوون، هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەكانیدا دەهاتنە خوار، بۆ ئەو هاوڕێیەی كە ئەوەندە بێ وەفابووە لەگەڵیداو لە ناسكترینو ناڕەحەتترین ساتەكانی ژیانیدا جێی هێشتووە!

لەگەڵ هەموو ئەمانەش بڕیاری دا، بە هەر نرخێك بێت هاوڕێكەی بدۆزێتەوە، بەڵام نە لە ماڵ، نە لە هیچ لەو شوێنانەی كە جاران پێكەوە دەڕۆیشتن نەبوو، بیری كەوتەوە كە هاوڕێكەی زۆرجار باسی شارێكی دەكرد كە چەند دڵگیرو سەرنجڕاكێشە، ئیدی بڕیاری دا، بچێتە ئەوێش تا بتوانێت سۆراغێكی بكات، بەڵكو چووبێتە ئەو شارە!

بۆ ڕۆژی دوایی بەڕێكەوت، كاتێك گەیشتە شوێنی دیاریكراو، چووە ئەو باخچەیەی كە هەمیشە هاوڕێكەی لە ڕۆژانی پێكەوەبوونیان، باسی دەكرد، كاتێك گەیشتە باخچەكە هاوڕێكەی بینی لەسەر كورسییەك دانیشتبوو، هێدی هێدی لە پشتەوە بەرەو لای هاوڕێكەی ڕۆیشت، بەبێئەوەی هاوڕێكەی پێی بزانێت، كاتێك گەیشتە بەردەمی بە چاوێكی پڕ لە خەمەوە بۆی ڕوانی، چونكە لە ناسكترینو ناڕەحەتترین ساتدا جێی هێشتبوو، ئیدی لەو دەمەدا هەرچۆنێك بێت بە چاوی پڕ لە ئەسرینو بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە لە پشتەوە كەوتە قسەكردن لەگەڵیدا.. دەبێت چی پێ بڵێت؟ ئێستا هەمووان دەڵێین: دەبێت بڵێ: ئەی بێ وەفا، ئەمە بوو، هاوڕێیەتی ڕاستەقینەو دڵسۆزی تۆ!!

ئەمە بوو وەفاداری و خۆشەویستیت؟

دەزانن ئەوەی زیاتر جێگەی سەرسوڕمان بوو، ئەوەبوو كە دوای ئەوەش كە گوێی لە دەنگی بوو، نە گرنگی پێداو نە لە شوێنی خۆی هەستاو نە ئاوڕی لێدایەوە! دەزانن بۆچی؟ ئایا بڕوادەكەن كە هاوڕێ خۆشەویستەكەی جارانی نابینێت، چونكە چاوەكانی لەدەستداوە؟!

ئەمەش دوای ئەوەبوو كە هەستایە سەرپێو بە یارمەتی گۆچانەكەی دەستی ڕێی تەی دەكرد، تا نەكەوێتە چاڵێكەوە!

ئایا دەزانن بۆچی؟ ئایا دەزانن كە بۆچی ئەم هاوڕێیە ئێستا نابینایە!

بیرتانە كاتێك وتمان كە هەواڵەكەی بیست هەموو وێنەی یادگارییەكانی دڕاند، لە یادتانە كە وتمان شوێنی كارەكەی جێهێشتو كەس نەیدەزانی بۆ كوێ ڕۆیشتووە؟!

ئەو كات ڕۆیشتبوو بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی كە هاوڕێكەی لێبوو، پرسیاری لە پزیشكەكەی كردبوو سەبارەت بە چارەنووسی چاوەكانی هاوڕێكەی، پزیشكەكەش لە وەڵامدا وتبووی، ئەو چاوەكانی لە دەستداوە، ئیدی بۆ هەمیشە ناتوانێت ببینێت، دەزانن هەڵوێستی ئەم دۆستە دەگمەنەی چی بوو؟ كە تا ئێستا ئێمەش واماندەزانی كەسێكی بێ وەفاو بێ ئەمەكو سپڵەو بێ هەڵوێستە، هەر لەو كاتەدا هەر دووچاوی خۆی پێشكەش بە هاوڕێكەی كردبوو، وتی: من نابینا بم باشترە لە هاوڕێكەم، ئیدی لەسەر داوای خۆی پزیشكەكە نەشتەرگەرییەكەی بۆ ئەنجامداو چاوەكانی بۆ هاوڕێكەی دانایەوە!

سەرەڕای ئەوەش بۆ ئەوەی هەستی هاوڕێكەی ڕاگرێت و هیچ كەسیش بەم كارەی نەزانێت، شارەكەشی جێهێشتووە!

ئەی دەبێت ئێستا هەڵوێستی ئەم كەسە چۆن بێت، كاتێك دەبینێت لەبەرچاوی خۆیدا، هاوڕێ خۆشەویستەكەی لەبەرخاتری ئەو كوێربووەو ئێستا بە گۆچان ڕێگە تەی دەكات!!

لە كۆتاییدا، هیوادارم هەمووان بتوانین وەفادارو بەئەمەك بین، بەرامبەر هاوڕێ و دۆستان و ئەزیزانمان، ناڵێم وەكو ئەم هاوڕێ دەگمەنە، بەڵام خۆ دەكرێت وەكو نیوەی ئەو، بەوەفابین!

# لە شەقامەوە فێربووم!

رەمەزان عەبدوڵا

کاتێك بە ڕێگادا دەڕۆیت، تەنها ٦٠ مەتری سەرەتا دەبینیت، پاش بڕینی ٦٠ مەترەکە، ٦٠ مەتری دیکەش ئاشکرا دەبێت، ژیانیش هەروایە لە پاش بڕینی ٦٠ مەتری یەکەم، ٦٠ مەتری ترت بۆ ئاشکرا دەبێت!

ڕۆژێك بە خەیاڵی شەقامەوە چاوەکانم نوقمی خەیاڵات بوون، سەرەنجام شتگەلێك لە شەقامەوە فێربووم، کەوا لە زانکۆکانیش دەستناکەوێت!

**لە شەقامەوە فێربووم:** کە ڕێگاکان هەروەکو ژیان، جۆراوجۆرن، جۆرە ڕێگایەکم بینی زۆر تەسك بوو، هەروەکو ناخۆشییەکانی ژیان، چۆن دڵی مرۆڤەکان تەسك دەکاتەوە!

لە هەمان کاتدا ڕێگایەکی ترم بینی فراوانبوو، بەڕاستی زۆر بە جوانی فراوانییەکەی دیار بوو! هەروەکو مرۆڤە دڵفراوانەکان، هەرگیز ئاستەنگێك لەو ڕێگا فراوانانە نایانوەستێنێت!

**لەشەقەماوە فێر بووم:** جۆرەها کەس بەم ڕێگایەنەدا دەڕوات!

ژیانیش هەروایە، کەواتە بۆچی دەبێت دڵم تەنگ بێت، کاتێك لە هەمان ڕێگاوە دەڕۆین؟ ئەی ئەوانیش مرۆڤ نین!!

با هەرچەندە خراپیش بن، بەڵام ئەوان مرۆڤن وەکو ئێمە! لەبەرئەوە هەموویانم خۆشدەوێت..

**لە شەقامەوە فێربووم:** کەوا هەموو شەقامێك تاسەی ناخۆشی تێدایە، بۆیە لە کاتی پێداڕۆیشتنیدا دەبێت ئۆتۆمبێلەکەمان هێواش بکەینەوە، تا زیانیکی زۆرمان بەرنەکەوێت!

ئیدی بۆچی دەبێت دڵم ناخۆش بێت، کاتێك زۆر کەس پێش من لەو تاسەیان داوەو بە سەلامەتی دەرچوون!

لە تاسەکانی ژیاندا هێواشی دەکەمەوە، تا بە هێواشی گوزەر بکەم بە نێو شەقامەکانی ژیاندا..

**لە شەقامەوە فێربووم:** ڕێگای سەرەکیو ڕێگای لاوەکی هەیە، ڕێگای سەرەکی ژیان، خاوەن ئامانجەکانن، ئەوان ئەو ڕێگایە دەگرنەبەر تا کۆتایی، با دووریش بێت، گرنگ ئەوەیە دەگەن بە ئامانجەکانیان!!

هەروەها فێری ئەوە بووم، کە ڕێگا لاوەکییەکانی ژیان، جگە لە جەنجاڵی، شتێکی دی نییە، بۆیە زۆربەی کەس لەبەر کورتی ئەم ڕێگایە دەگرنەبەر!

ئاخۆ چەند کەس ئەم ڕێگا ناخۆشەیان تاقیکردبێتەوەو لێی دەرنەچوون، نەیانتوانیوە بێنەوە سەر ڕێگای سەرەکی ژیان؟!

**لە شەقامەوە فێربووم:** ئەوەی بەسەر شەقامەکانەوە گوزەر دەکات ئۆتۆمبێلەکانن!

هەیانە خێرایە لە ڕۆیشتندا، هەشیانە هێواشە.. هەیانە ئۆتۆمبێلەکەی نوێیە، ئەوەی لە ناویەتی کۆنە! هەشیانە ئۆتۆمبێلەکەی کۆنەو ئەوەی لە ناویەتی نوێیە!

بەڵێ ژیانیش هەروایە، مرۆڤەکان گوزەردەکەن بۆ ڕێگای ژیانیان بۆ ئاواتو ئامانجیان!!

هەیانە زۆر خێرا دەگاتە ئامانجەکەیو بە دەستی دێنێت!

هەشیانە تۆزێك بە هێواشی ئامانجو هیواکەی دێتە دی، بەڵام کۆڵنادات بۆ ئامانجەکەی، ڕێگای سەختی ژیان دەگرێتەبەر تاکۆتایی!

هەیانە لە ژیاندا زۆر دەوڵەمەندە، بەڵام بۆ ساتێك تامی لەو خۆشییە نەکردووە کە لە ناویدا دەژی، بەم چەشنە لەو ئۆتۆمبێلە نوێیە دەچێت کەوا ئەوەی لە ناویەتی کۆنە!

بەڵێ هەژارانێکمان هەیە لە ژیانیان زۆر دڵخۆشن، زۆر دڵخۆشن لەو ژیانەی تیایدا گوزەر دەکەن، بەو بەشەی هەیەتی ڕازییە، لە کاتی نوستنیدا بە ئاسوودەیی سەر دەکاتە سەر سەرینەکەیو بە ئارامی دەخەوێت! ئەوەش لەو چەشنە ئۆتۆمبێلە دەچێت کەوا کۆنەو ئەوەی ناویشی نوێیە!

هەشیانە هەردووکیان نوێیەو هەشیانە هەردووکیان کۆنە!

**لە شەقامەوە فێربووم:** لە ڕێگاکان وەستانی کاتی هەیە، ئێمە پێی دەڵێین: (ترافیك لایت)..

بەڵێ خۆیەتی، ئەها ئەو سێ ڕەنگەی هەمیشە لامان وەکو ناسیاوێکی لێهاتووە کە لەبەردەمیدا ڕادەوەستین!

بەڵێ ژیانی مرۆڤەکانیش وەهایە ئەوانەی بۆ ماوەیەکی کاتی لە ژیان دادەبڕێن، بەڵام لە کاتی ڕۆیشتنی بەردەوام دەبێت!

لە کاتی وانەکاندا گەیشتمە شوێنی مەبەست، ئەو شوێنەی لەو ڕێگایەدا بۆی دەڕۆیشتم، ئاخۆ چەندانی وەکو من بەو ڕێگایەدا گوزەردەکەن!!



# خەڵوەتگەی دۆستان

روئیا عەبدوڵا

نازانم چۆن پێت بڵێم؟ زەلیلیشم لە پاڵ تۆدا سەربەرزییە، کەوتنیشم لە تەك تۆدا سەرکەوتنە، تاریکیشم ڕووناکییە، خەمباریشم شادییە، ساردوسڕیشم گەرمبوونە، بێ چراش بم، دونیام ڕوونە، تۆ فریشتەیەکی بەرگ سپی، خودا بۆ ئێمەی ناردوویت، مامۆستایەکی ڕێگەمان پێنیشان دەدەیت، ڕێگەی تاریکمان بۆ ڕووناك دەکەیتەوە، تاوێڵی دۆزینەوەی ڕووناکی بین، ئەی شەوی یەڵداو دەیجور، تۆ ئەو شکستەی نامکوژێت، بەڵکو بەهێزترم دەکەیت، تۆ ئەو ڕێگەیەی ونبوونیشم لە نێو تۆدا، دۆزینەوەی ژیانە.

ئەی ئەو درەختە چوار وەرزەی ساڵ، من تکا دەکەم وام لێبکەو تا عادەت بە بێداریت بگرم، چوون بێداربوون لەگەڵ تۆدا، مانای بێ ئاگایی خەمە لای من. هەمیشە نزادەکەم کە چ زووتر خۆرئاوابێو سەمای ئارامی لە باوەشی ئاوازەکەی تۆدا بکەم، بۆ هەمیشە ئاواتی دووبارە نەهاتنەوەی سەحەر دەکەم، مەگەر هەر شاعیری پایەبەرز توانای ڕاستی پەیڤی حەقو گوفتاری شیرینی هەبێت، وەك مەحوی شاعیر لەم دێرە شیعرانەدا دەڵێت:

هەرکەسێك تالیب بە دووری بە ماریفەت کۆکردنە

پڕ لە دوور دەریاییەکی بێ مەهلەکەی خنکانە شەو..

واتە: هەرکەس دەیەوێت، دووریی خوداناسی کۆبکاتەوە، بابزانێ شەو دەریایەکی پڕە لەم دوڕڕە، هەرکەسیشی تێبچێ، ترسی خنکانی نەبێ، وەك لە دەریای ئاودا. کەوابێ ئەی جوانترین کاتی سروشت، ڕۆچوونیشم لە نێوی تۆدا وەك هاتنە دەرەوەی ئەڵماسە لە ژێر زەوی، چوون گەر ڕۆبچم لە نێوی تۆ، وەك ئەو ئەڵماسە دەبم کە خۆی حەشارداوە لە ژێر زەوی،

هەر لە تاریکی شەوایە ڕێ درێ ئەهلی نیاز

ڕازی دڵ ئیفشابکەن خەڵوەتگەهی خاسانە شەو

واتە: مەگەر هەر لەتاریکی شەودا ڕێگایی دڵداران بدرێ، ڕازی دڵیان بۆ یەکتر دەرخەن، چونکە شەو خەڵوەتگایی دۆستانە، تۆ منت پەروەردە کردووە ئەی شەو، کۆتی شەرمەندەییت شکاندووم، وات لێکردووم ئەوەی لە ڕۆژ لە نێو دڵەبچوکەکەم پەنگ دەخواتەوە لە کاتی هاتنی تۆ ئیفشایی بکەمو دەریبخەم. ئەی هاودەمە ڕەشپۆشەکەم، بچووکیشم لەگەڵ تۆدا گەورەییە. ئەی شەوی جوان من هەمیشە ئاوات بە حاڵی بوونو تێگەیشتن دەخوازم، وام لێبکە زیاتر تێبگەم تا وەك ئاسمان کە چۆن فرمێسکی تۆی بە پەنهانی حەشارداوەو بەشێوەی ئەستێرە نیشانی ئێمەی دەدات، منیش دەمەوێ زیاترو زیاتر تێبگەم، تا زیاتر ئاوێتەبم لەگەڵ تۆدا. چوون لەگەڵ تۆیا فێری وەفاداری دەبم، وەك چۆن وەفاداریت نواندووە بۆ مەعشوقەکەت کە ڕۆژە. بەرگی ڕەشت کردووەتە بەرگی هەتاهەتایی، چونکە دڵنیای کە ئیتر دیدەکانت بە خۆری جوان ڕۆشن نابێت، ئەها لە تۆوە فێری وەفاش دەبم، بۆیە دیسانەوە ستایشت دەکەمو دەڵێم: ئەی شەو لە تاریکیتدا، ڕووناکی ژیان بەدی دەکەم، لە بێدەنگیتدا گوێم لە هاواری شادییە، بانگم دەکات بۆ لای خۆی، ئەی شەوی گەورەو بەرز. ئەی باوەشی دایك ئاسا، تۆ دەبێت باوەشێکی چەندە میهرەبان بیت، بۆیە لە کاتی هاتنی تۆ عاشقان دەردەداران چاوەڕوانن، خوداناسان دێنو بە کۆڵێ خەمو بە دونیایەك مەراقو هیواوە، لەگەڵ تۆ بێداردەبن، هەر بۆیە خوداگیانیش تۆی هەڵبژاردووە لە کاتی هاتنی تۆ، تا بەندەکانی لەگەڵی بکەونە ژووانو دەیەوێ نزیکتربێت لە کائینەکانی، تاباشتر گوێ بۆ ڕازوو نیازەکانیان بگرێت، دەیەوێت لە خەڵوەتگەی ئارامیدا، ئەرخەیانتر لەگەڵیان گفتوگۆ بکات!

بەرزان ئەبوبەکر



# ئەو سیفەتانەی ئافرەتان حەزناکەن لە هاوسەرەکانیاندا هەبێت!

لە ژمارە (٣٩- ٤٠)ی بڕیاردا، باسمان لە هەندێك لەو سیفەتانە کرد کە هاوسەران حەزدەکەن لە یەکدیدا هەبن، بێگومان مرۆڤ بە سیفەتە جوانەکانەوە دەتوانێت درێژە بە ژیانی هاوسەریو خۆشگوزەرانیو ئاسوودەیی بدات.. دەتوانێت ژیانێکی ئارام و ئاسوودە، دوور لە ناکۆکیو شەڕو ئاژاوە، فەراهەم بهێنێت، لە هەمان کاتدا پێویستە خۆمان لە سیفەتە خراپو نێگەتیفەکان دابڕنین، چونکە گومانی تێدا نییە کە چاكو خراپ پێکەوە کۆنابنەوە، هەموو سیفەتێکی خراپ و نێگەتیف بەپێچەوانەی سیفەتە باشەکانەوە، دەبنە هۆی شەڕو ئاژاوەو ناکۆکیو دووبەرەکیو سەرەنجام جیابوونەوەو لەیەکترزان.. لەبەرئەوە لەم بابەتەدا باس لەو سیفەتە نێگەتیفانە دەکەین کە ئافرەتان حەز دەکەن لە هاوسەرەکانیاندا نەبێت، بە پشتیوانی خودا لە ژمارەی ئایندەشدا باس لەو سیفەتانە دەکەین کە پیاوان حەز دەکەن لە خێزانەکانیاندا نەبێت..

گومانی تێدا نییە کە سیفەتی خراپو نێگەتیف زۆرن، بەڵام ئێمە بۆئەوەی زۆر درێژە بە باسەکەمان نەدەین، سەرەکیترین ئەو سیفەتانە باس دەکەین کە ئافرەتان ڕقیان لێیەتیو حەزدەکەن هاوسەرەکانیان لەو سیفەتانەوە بە دووربن..

١- چاوباشقاڵ: ئەم سیفەتە بەو کەسە دەوترێت کە بەردەوام چاوی دەگێڕێتو سەیری ئافرەتان دەکاتو تانەو تەشەریان لێدەدات، بێئەوەی هیچ حسابێك بۆ هەستو نەستی خێزانەکەی بکات، تەنانەت زۆرجار کە لەگەڵ خێزانەکەشیدا لە گەشتێکدایە، یاخود دەڕواتە بازاڕ، یان سەیران، یا هەر شوێنێکی دیکە، بەردەوام چاوی بە دوای ئافرەتاندا دەگێڕێت، یاخود لە شوێنە گشتییەکان و بەردەم زانکۆو پەیمانگاکان ڕادەوستێ، وەکو ئەوەی لە نێو کۆشکێکی دڵڕفێندا وەستابێت، تەنانەت لە کاتی سەیرکردنی تەلەفزیۆنیشدا، نەك فیلمو گۆرانی، بەڵکو زۆرجار لە کاتی سەیرکردنی خوێندنەوەی هەواڵیشدا، گەر بێژەرەکە ئافرەت بوو، بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەکاتو چاوی لەسەر ناترووکێنێو بە قەدو باڵایدا هەڵدەدات، بەشێوەیەکی گشتی ئەم سیفەتە لە هەر شوێنو جێگەیەك بێت، یەکێکە لەو سیفەتانەی ئافرەتان بێزار دەکاتو لە هەمان کاتدا بە سیفەتێکی نەرێنیو ڤێزەونی پیاوان دادەنرێت، لەبەرئەوە زۆر پێویستە پیاوان لەم سیفەتە خۆیان بە دووربگرن..

٢- ڕاڕا: کەسی ڕاڕا کاتێك ئافرەتێکی جوانتر لە هاوسەرەکەی خۆی دەبینێت، سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕێتو وا دەزانێت گۆڕینی هاوسەر وەکو گۆڕینی جلوبەرگو کەلوپەلەکانییەتی، لە دوای بێزاربوون لێیان بڕوات جلوبەرگێکی مۆدێرنترو جوانتر بکڕێت، ئەم جۆرە کەسانە بەبێئەوەی حساب بۆ هەستی مرۆڤانەی خێزانەکانیان بکەن، هەر زوو بە بیانووی لاوازو بێ بنەما دەست

لە هاوسەرەکانیان هەڵدەگرنو لێیان جیادەبنەوە، ڕەنگە لە دە ساڵی یەکەمی هاوسەرگیریدا چەند جارێك پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام بدات، لە زانستی دەروونناسیدا ئەمجۆرە کەسانە لە سیفاتو هەڵسوکەوتدا دەچوێنرێن بە مەیموون، مەیموون کاتێك دەچێتە سەر لقی درەختێك، ئەگەر لقێکی جوانتری بینی، لقەکەی خۆی بەجێدەهێڵێتو دەڕواتە سەر لقە نوێیەکە.

**٣- لاسایی کەرەوەی ئافرەتان:** ئەمجۆرە کەسانە لە جلوبەرگو کەلوپەلو تەنانەت ڕۆیشتنیشدا لاسایی ئافرەتان دەکەنەوە، بۆیە دەبینیت جلەکانیان لە قوماشی نەرمو تەسك دەدوورن، بە نرخترینو گرانبەهاترین بۆن بەکاردەهێنن، تەنانەت لە کڕینی کرێمو جێڵو ئەو شتانەشدا کێبەرکێ لەگەڵ ئافرەتاندا دەکەن، نیوەی داهاتی مانگانەیان بۆ کڕینی جلوبەرگو پێڵاوو مۆدێلات خەرج دەکەن!

**٤- فەرامۆشکار:** ئەو کەسەیە کە تەنانەت کەسایەتی خۆشی فەرامۆش دەکات، دەبینیت هەمیشە کەسێکی هەڵوەشاوەو بۆنی ناخۆشو جلی ئوتوو نەکراوو چڵکنە، هەمیشە جلوبەرگەکانی بە جارێك شۆرین پاك نابێتەوە، بەڵکو پێویستی بە چەند جارێك شۆرینە.

**٥- چرووكو ڕەزیل:** ئەو کەسەیە کە بەردەوام ماڵەکەی کۆدەکاتەوەو دەیژمێرێت، تەنانەت خۆشیو شادیو تاموچێژی ژیان لە منداڵەکانیشی مەحروم دەکات، لە ترسی ئەوەی نەبادا لە ئایندەدا دووچاری هەژاریو کەمدەرامەتی ببن، دینار دینار لەسەر خێزانەکەی حساب دەکات، مەگەر مانگی جارێك تامی گۆشت بکەن، خێزانەکەشی شەرمەزار دەبێت، بە هۆی جلوبەرگی کۆنو کەمی پێداویستییەکانی ژیانی، هەموو ڕۆژێك خێزانەکەی گیانی دەردەچێت تا خەرجی منداڵەکانی لێ وەردەگرێت..

**٦- منەتکار:** ئەو کەسەیە کە هەمیشە منەت دەکات بەسەر هاوسەرەکەیدا، هەر شتێکی پێببەخشێت، یان بۆی دابین بکات، بەردەوام وەکو منەتێك بە چاویدا دەداتەوەو هەمیشە ئەم قسەیەی لەسەر زارەو دەڵێت: لە بیرتە فڵانە ڕۆژ ئەوەو ئەوەم بۆ کردیت، لەبەرئەوە خێزانەکەی بە دیارییەکانی دڵخۆش نییە، چونکە دەزانێت کە دوای مانگێك دەیداتەوە بە چاویدا، ئەگەر لە هاویندا خێزانو منداڵەکانی بباتە گەشتێکی چەند ڕۆژە، ئەوا تا ساڵی ئایندە باسی دەکاتەوە.. تەنانەت ئەگەر خێزانەکەشی چێشتێکی خۆشو بەتام ئامادە بکات، ئەو منەتی دەکات بەسەرداو دەڵێت: پێداویستییەکانی خواردنەکەت من کڕیومە، بۆیە تۆ توانیوتە ئەو خواردنە ئامادە بکەیت!

**٧- خاوەن سروشتێکی ناخۆش:** لەجلوبەرگدا، لە هەڵسوکەوتدا، لە خواردندا، لە چوونەدەرەوەدا، لە هەڵبژاردنی ڕەنگدا، تەنانەت لە ناونانی منداڵەکانیدا، بە هیچ شتێك ڕازی نابێت، ئەگەر هاوڕا نەبێت لەگەڵ زەوقو ئارەزووی ئەودا، لەبەرئەوەش زەوقی قورسو شازە، شتێك نابینێت هاوڕا بێت لەگەڵیدا، چێشت خوێی کەم بێت، چا زۆرشیرین بێت، ڕەنگی قوماشو جلەکانی زۆر تیر بێت، ئیدی هەرشتێكو هەر چۆنێك بێت، ڕەخنەیەکی لێدەگرێت، ئەگەر ئاوابووایە چاکتر دەبوو..

**٨- لاوازیی کەسایەتی:** ئەمجۆرە کەسانە بە زۆری دایکو خوشکەکانی سەرپەرشتیارو بەڕێوەبەری کاروبارەکانی نێوماڵی بۆ دەکەن، دایکی، پوری، دەست لە کاروباری نێوماڵی وەردەدەن، لە هەمان کاتدا وادەزانێت خێزانەکەی یارییەکە لەبەردەستیدا، هەموو هەواڵێکی ماڵەوەی لای خوشکەکانی هەیە، بە بیانووی ڕاوێژکردنو پرسکردن، براکانی ڕادەسپێرێت بۆ زۆرێك لە ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی ماڵ، دەروونناسان دەڵێن: ئەمجۆرە کەسانە ئەوەندە لاوازن لە بەڕێوەبردنو متمانە بەخۆبووندا، زۆرجار شایەنی ئەوەنین نازناوی پیاوەتی هەڵگرن.

**٩- مۆنو گرژو تووڕە:** ناسراوە بە پیاوە سەوزەکە، کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، بە هۆی تێڕوانینە ئاگرینەکانییەوە، هەموو بێدەنگ دەبن، هاوار بۆ ئەو کەسەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکات، یان لە ڕوویدا ڕادەوەستێت، کاتێك تووڕە دەبێت زمانی زۆر پیسە، ئەوەندە مۆنو گرژە، تەنانەت لە کاتی وێنەگرتنیشدا پێناکەنێت. وادەزانێت هەناسە بۆ خێزانەکەی دەدات، کاتێك تووڕە دەبێت چی لەبەردەستدا بێت، پەرداخ سوراحی، پیاڵە، پێڵاو... دەیهاوێژێت!

**١٠- تەمەڵو دەستەوسان:** لە زانستی دەروونناسیدا ئەمجۆرە کەسانە ناودەبرێن بە (دەستەوسان)، ئافرەت بە سروشتی خۆی ڕقی لە پیاوی تەمەڵە، مرۆڤی تەمەڵ کاروپیشەی خەوو خواردنە، هیچ کات بیر لە گۆڕانکاریو بەرەوپێشچوونو برەودان بە لایەنی ماددیو مەعنەوی ناکاتەوە، هەوڵی گۆڕانکاری بەرەو ژیانێکی باشترو دابینکردنی گوزەرانێکی ئاسودە بۆ خێزانەکەی نادات، بە بیانووی جۆراو جۆری لاوازو بێ بنەما، ئافرەت حەزدەکات هاوسەرەکەی چالاکو گورجو گۆڵو خاوەن هیواو ئاوات بێت، بەردەوام هەوڵ بدات بۆ دابینکردنی ژیانی باشترو ئاسوودەتر بۆ خۆیو خێزانو منداڵەکانی..

**١١- پیاوی گومانایی:** ئەمجۆرە کەسە لە هەموو شتێکی خێزانو منداڵەکانی بە گومانە، متمانەی جگە لە خۆی، بە کەس نییە، بێگومان جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئیرەییو گوماندا، گومان لە متمانە نەبوونەوە سەرچاوەدەگرێت، بەڵام ئیرەیی لە خۆشەویستییەوە، بە مەرجێك لە سنوور دەرنەچێت! گەر لە سنوور دەرچوو ئەوا لە ئیرەییەوە دەگۆڕێت بۆ دڵپیسی، دڵپیسیش یەکێکە لەو سیفەتانەی ئافرەتان زۆر بێزار دەکاتو ژیانو گوزەرانو پێکەوە ژیان بەرەو ئاقارێکی خراپو تاڵ دەبات.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی مرۆڤی دڵپیس، هیچ کات ناتوانێت ئاسوودە بێت، چونکە بەردەوام لە بیری ئەوەدایە کە ڕەنگە هاوسەرەکەی خیانەتی لێبکات، هەمیشە لە دڵەڕاوکێدایەو ناتوانێت ساتێك بە ئارامیو بێ بیرکردنەوەی نەرێنی بژی، هەر بۆیە ئەم سیفەتە بە قێزەونترین سیفەتی هاوسەر دادەنرێت، لە هەر ماڵێکدا ئەم سیفەتە بوونی هەبوو، بەختەوەریو ئاسوودەیی و کامەرانیو خۆشگوزەرانی ماڵاوایی دەکات.. جگە لەوەش خاوەنەکەی خۆی تووشی دەردێکی کووشندە کردووەو تەنانەت ناتوانێت گەشتێکی ئاسوودەش ئەنجام بدات، دڵیشی دووچاری دەردێك کردووە کە چارەسەری لای هیچ پزیشکێك دەستناکەوێت، ئاواتەخوازم هاوسەران بتوانن بۆ هەمیشە لەم سیفەتە خراپ و قێزەونە خۆیان بە دووربگرن!

بە هیوای ژیانێکی بەختەوەرو ئاسوودە بۆ هەمووان!

عەبدولمەناف عەبدولعەزیز

# هەڵەكان، جێگای قبووڵكردنن



مرۆڤ بوونەوەرێكە هەر لە سەرەتای درووست بوونییەوە، تاكو ئەمڕۆش دەروونبەرزی وای لێكردووە زۆرێك لە ڕاستییەكانی ژیان قبووڵ نەكات، ئەوەش نەوەك لە بەرژەوەندی ئەو نییە، بەڵكو كارەكە لێرەدا سووربوونو بەردەوام بوونە لەسەر كارێك كە لە ڕابردو ئەنجامی داوەو نایەوێت پاشگەزبێتەوە، گەرچی لە هەڵەش دابێت بەلایەوە گرنگ نییە.

لێرەدا شتێك ڕوونو ئاشكرایە كە هەر مرۆڤێك دێتە ژیانەوە قبووڵ كراوە گەر هەڵە بكات، بگرە بۆ چەند جارێكیش بێت، چونكە ئێمە لە هەڵەكانمانەوە فێری گەلێك شت دەبینو پەندو ئامۆژگاری وەردەگرین، كەواتە هەڵەكردن شتێك نییە ببێتە مایەی شەرمەزاری بۆ خاوەنەكەی، چونكە دڵنیام هەمووومان گوێبیستی زۆرێك لە چیرۆك بووین كە لە هەڵەكانیانەوە خاڵی سەركەووتنیان دۆزیوەتەوە، بەڵام پێویستە لەسەرمان لە هەر هەڵەیەك كە لە ژیاندا ئەنجامی دەدەین شتێك فێرببین، ڕاستییەكمان بۆ ڕوون ببێتەوە كە لە ڕابردوودا هەستمان پێنەكردووە.

بە بڕوای من زۆرێك لە مرۆڤەكان بە كارێكی سەختی دەزانن ئەگەر دان بە هەڵەكانیاندا بنێن، یاخود بڵێت من ئەو هەڵەیەم ئەنجامداوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە لە زۆرێك ڕووداوەكان بە بێتاوان خۆیان لە قەڵەم دەدەن. بۆ نموونە (دوو هاوڕێی زۆر خۆشەویست كە بەردەوام هۆگری یەكبوون، زۆرێك لە كاتەكانی ڕۆژانەیان بە یەكەوە بەسەر دەبرد، تاكو گەر خوێندنیشیان هەبووایە بە یەكەوە وانەیان دەخوێند، ماوەیەك هەستم دەكرد كە پەیوەندییان وەكو جاران نەماوە، بە شێوازێك ڕەفتاریان دەكرد وەك دوو كەس كە هەرگیز یەكتریان نەبینیووە، هەستم بە دڵتەنگی دەكرد، بۆیە چوومە نێوانیانەوە، كاتێك چوومە لای یەكێكیان پرسیارم لێكرد كە ئەو پەوەندییەی ئێوە هۆكارەكەی چییە كە بەم ئاڕاستەیەداچووە، كەوتە قسەكردنو باسكردنی هەڵەكانی هاوڕێكەی، كاتێكیش چوومە لای ئەوی تریان هەمان پرسیارم ئاڕاستە كرد، بە هەمان شێوە دەستیكرد بە باسكردنی هەڵەكانی بەرامبەر)، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا ئەوە ڕاستە هیچ كامێكیان لە هەڵەدا نەبن؟ بە بڕوای من شتێكی بەڵگە نەویستە، بێگومان یەكێكیان لە هەڵەدان، بەڵام چونكە مرۆڤ لە ناخییەوە هەست بە گەورەییەكی زۆر دەكات، بیر دەكاتەوە گەر بڵێت بە هاوڕێكەی كە من لە هەڵەدام، بە شێوازێك هەست دەكات كە ئەم گەورەییە بچووك دەبێتەوە، بەڵام بەداخەوە لە ڕاستیدا مرۆڤ لە دیاریكردنی ئەم هەستەشدا هەڵەیە، چونكە ئەگەر بیربكەینەوەو بە شێوازێك بە هاوڕێكەت گوت: بمبورە من لە هەڵەدابووم بەرامبەر بە تۆ، چەندە دڵی هاوڕێكەت خۆشدەكەیت، چەندە هەست بە گەورەبوونی تۆ دەكات لە لایەن خۆیەوە. كە ڕەنگە هەندێجار هەردووكیان لە هەڵەدابن، بەڵام بە هۆی ئەو ڕاستییەی كە باسمان كرد، ڕەنگە دەروونبەرزی هیچكامێكیان ڕێگەیان پێنەدات كە ئەم كارە ئەنجامبدات.

یان قازی كاتێك لە كەسی گومانلێكراو پرسیار دەكات، كە ئایا تۆ ئەو دزییەت ئەنجامداوە، یان هەر تاوانێكی تر؟ وەڵامی زۆرێك لە تاوانبارەكان، بگرە دەتوانم بڵێم هەموویان، دەڵێن: من بێتاوانم، ئێوە بە هەڵەداچوون بەرامبەر بە من، من كاری وام نەكردووە، بەڵام كاتێك قازی هەندێ بەڵگەی بۆ دەخاتە ڕوو، كە ڕاستی ڕووداوەكە ڕووندەكاتەوە كە ئەو تاوانبارەكەیە، بگرە هەندێك بە هۆی بوونی زۆرێك لە بەڵگەكانەوە، هێشتا دەروونبەرزی ڕێگەی پێنادات دان بەڕاستییەكەدا بنێت، بەڵام كاتێك كرداری توندوتیژی بەرامبەر بەكاردێنن زۆرێك لە تاوانبارەكان، دان بە هەڵەكانی خۆیاندا دەنێن، باشە بۆ دەبێت مرۆڤ بەم شێوازە هەڵسووكەوت بكات، ئەوە پرسیارێكە ئاڕاستەی هەموو مرۆڤێكی خاوەن ژیری دەكەم، با هەموو مرۆڤێك بزانێت كە هەڵەكردن هەڵە نییە، بەڵكو دووبارەكردنەوەی هەڵەیە.



پێگەرد فارس

# پەیامێکی بێناونیشان!

ئەم پەیامە چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە، لەسەر زاری ئەو کەسانەوە نێردراوە کە خۆیان لەناوجەرگەی بەسەرهاتی چیرۆکەکاندا بوون، یەکێك لەوانە دەڵێت: بڕی دووسەد هەزار ڕیاڵم لە پیاوێك بە قەرز وەرگرت، بۆئەوەی پرۆژەیەکی پێ جێبەجێ بکەم، سەرکەوتووانە پرۆژەکەم ئەنجامداو سوودوقازانجێکی زۆریشم کرد، بەڵام کاتێك ماوەی قەرزەکەم تەواو بوو، کابرای خاوەن قەرز هات بۆلام، بە مەبەستی وەرگرتنەوەی پارەکەی، منیش نکوڵیم کردو حاشام کرد لەوەی پارەی ئەوم وەرگرتبێت، سەرباری ئەوەش لە نووسینگەکەم کردمە دەرەوە، بێ ئاگا بووم لەوەی بە هۆی ئەو ستەمەی کردم چی چاوەڕێم دەکات، پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ، نزیکەی نیو ملیۆن ڕیاڵ زیانم لێکەوت!

پاش ئەوەش زیان دوای زیان، بەرۆکی بەر نەدەدام.

هەرچەندە هاوسەرەکەم ئامۆژگاری دەکردم بە گەڕانەوەی بڕی ئەو پارەیەی وەرمگرتبوو، بەڵام بە هۆی کەللەڕەقیمەوە گوێم بە وتەکانی نەدا، تا ئازیزترین شتم لە دەست دا، ئەویش بە هۆی ڕووداوی ئۆتۆمبیل سێ کوڕم مردن!

ئەو کات بڕیاری گەڕانەوەی پارەکەم داو داوای لێخۆشبوونم لێکرد، نەوەك تاکە شتێك کە ماوە ئەویشم لە دەست بچێت، ئەوانیش هاوسەرو کچە حەوت ساڵانەکەمن!

نورا مامۆستای زانکۆ بوو، سەرگوزشتەی ڕووداوی چیرۆکێکی تر دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

دووجار تەڵاق دراوم، چیرۆکی ستەمی من حەوت ساڵ لەمەوپێش بوو، پاش تەڵاقی دووەمم پێم خۆش بوو، هاوسەرگیری لەگەڵ خزمێکم بکەم کە خاوەنی پێنج منداڵ بوو، لەگەڵ هاوسەرەکەشی ژیانێکی ئارامو ئاسوودەیان هەبوو، لە هەمان کاتدا کوڕێکی پورم یەکلایەنە هاوسەرەکەی ئەوی زۆر خۆشدەویست، هەر بۆیە پێکەوە بڕیارمان دا، بە پلانێك لە یەکیان جیا بکەینەوە، تۆمەتی خیانەتمان دایە پاڵ خێزانەکەی، هاوڕێیەکی پورزاکەم کە لەگەڵماندا ئاگاداری پلانەکە بوو، شایەتی خیانەتەکەی داو ئەمەش بووە هۆی ناکۆکیو تێکچوونی پەیوەندی ئەو خێزانەو پاشان جیابوونەوە!

پاش ماوەیەك ئافرەتەکە لەگەڵ پیاوێکی پلە بەرزدا هاوسەرگیری کردو هاوسەرەکەشی کە من دەمویست بمخوازێت ئافرەتێکی تری خواست، واتە نە من نە پورزاکەم بەوەی کە ویستمان نەگەیشتین! پاش سێ ساڵ دوای ئەو ڕووداوە، من تووشی شێرپەنجەی خوێن بووم، پورزاکەمو هاوڕێکەی، ئەوانیش هەردووکیان بە هۆی کارەباوە سوتانو گیانیان لە دەست دا!

ئەمانەو چەندین بەسەرهاتی تر ڕۆژانە بەسەر زۆرێك لەوانەدا دێن کە ستەم لە کەسانی تر دەکەنو بێ باکن لەوەی کە لە داهاتوویاندا تووشیان دەبێت، گومانم نییە کەسێك هەبێت بێ ئاگا بێت لە سزای ئەو ستەمەی دەیکات کە خوای گەورە بەڵێنی تۆڵە سەندنەوەی داوە، بەڵام زۆرکەس لە بیریان دەچێتەوە، یان بیر خۆیانی دەبەنەوە، یاخود گرنگی بەوە نادەنو بە ئاسان بۆی دەڕوانن.

جا ئەو ستەمە لە هەرکەسێکەوە بێت، بەڕێوەبەرێك بۆ فەرمانبەرەکانی، دوکاندارێك لە کڕیارەکانی، یان دایكو باوکێك بۆ منداڵەکانیان، یان منداڵێك لە دایكو باوکی... هتد.

ئەوە پەیامێکی بێناونیشانە، بۆ ئەو کەسانەی ستەم دەکەن، یان ستەمیان کردووە، بەڵکو بە هۆیەوە هۆشیان بێتەوە سەرخۆ، ئەگەریش نەهاتنە سەر ڕێ، ئەوا پێویستە دڵنیابن لەوەی تۆڵەی خوای گەورە سەختەو چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بن کە پەشیمان دەبنەوە، بەڵام پەشیمانیش دادیان نادات.

ئیدی تا کات ماوەو هێشتا زیندووین، گەر ستەممان لە کەسێك کردووە، دەرفەتی داواکردنی لێبوردن لە بەردەمماندایە، پێش ئەوەی دووچاری سزای سەختی ئەو ستەمە ببین، با پەشیمان بینەوەو داوای لێبوردن لە خاوەنەکەی بکەینو گەر لە تواناشدا هەبوو قەرەبووی ئەو ستەمە بکەینەوە!

# نوورێکی نوێ

ئێستا کە ئەم نامەیت بۆ دەنووسم، بە تەنیا لە ژوورەکەم دانیشتوومو جگە لــە چرایەکی کــزو چەنــد پەڕەیەکی پــەرشو بــڵاوو چاویلکەکــەم، هیــچ هاودەمێکی ترم نییە، بەڵام وا هەســت دەکەم، ئێســتا بەرامبەرم دانیشتوویو وێنەی ڕووخسارت لەبەر دیدی خەیاڵم بۆ ساتێك نابزوێت!

جار جار بەدەم نووســینەوە، سەرم هەڵدەبڕم وەکو کەسێك بدوێنم، نیگایەك ئاڕاســتەی ســیمای پڕ نــورت دەکەم و دووبارە دەست بە نووسین دەکەمەوە.

لــەو ڕۆژەوە بە پێی ڕێو ڕەســمی قەدەر بە ڕۆحت ئاشنا بووم، لە دورێ ڕا هەستم دەکرد، لە یەکتردا دەتوێینەوەو ڕۆحم ئاوێزانی ڕۆحت بووەو ئیتر بێ تۆ نەمدەتوانی هەڵبکەم!

شــەوانە تــا درەنــگ لەگــەڵ ئەو ڕۆحەدا دەدوام، وەکو دایکێك کۆرپەکەی خۆی، یا مەلێــك زێدو هێلانەی خۆی دۆزیبێتەوە، وەها دەهاتە پێش چاوم.

ئاخــر من لــە زەمانێکــدا دەژیم، خەریکــە وەکو (ئەرســتۆ) لــە نوێژی نیــوەڕۆدا، چرایــەك هەڵکــەمو بــە شــوێن مرۆڤدا بگەڕێم، من لەم ژیانە بێزارم، هەموو شــتەکان ساختەکراونو هیــچ شــتێك وەکو خۆی نەمــاوە، من خەریکە شــێت دەبم، ناتوانم بێ سۆزو خۆشەویستیو باوەشــێکی گەرم درێژە بــە ژیانم بــدەم، هەمــوو مرۆڤەکانی دەوروبــەرم ڕۆژانە وەکو تارمایی دێنە بەرچاومو شــەوانیش وەکــو دێوەزمە دەست دەنێنە بینە قاقام.

من لە هەموو ئەو شتانە مەحرومم کە ژیــان هەناســەی پێــدەدات، بەڵام هەزارو یــەك هۆکاری مەرگو ماڵاوایی لەم دنیایەم لەبەردەمدایە!!

من بــە بینینی تۆ، تروســکەیەکی گەش لەو هیوایــەی کە هیچ باوەڕێکم پێ نەمابوو، جارێکی تر لە نێوەڕاستی دڵمدا سەری هەڵدایەوە!

مــن ئێســتا لە بــری ئەو دەســتە نەرمەی دەبوا لە منداڵیم ڕا بەســۆزو خۆشەویســتییەوە دەســت لەملانمبا، دەســت لە ملانــی وتــە جوانەکانتو بیرۆکە بەرزەکانتم!

ئێســتا من بــێ ئەو میهرو ســۆزە ناتوانم بژیم!

تــکا دەکەم، لە نێوەڕاســتی ڕێگەدا جێــم مەهێڵــە، پەنجــە گەرمەکانــت لــە پەنجــە باریــكو بێهێزەکانی من مەترازێنە.

دەستەکانم بگرەو لەو ڕێگا پڕنورە، بەهرەمەندمکــەو باچیتــر لە گێژاوی بێهیواییــدا ون نەبمو لە تاریکســتانی غەفڵەتدا نوقم نەبم.

چراکــەم خەریکــە دەکوژێتــەوە، گریانێکی قــوڵ، گەرووی تاســاندووم، ناتوانــم چیــدی بتدوێنــم، لەوانەیە فرمێســك بەشــێکی نامەکــەی شێواندبێت، وەلێ ئەگەر نامەکەشت بۆ نەخوێندرایەوە، گوزارشی فرمێسکەکان، دەتوانن یارمەتیت بدەن!

نازانم ســبەینێ چی دەبێت، بەڵام هێنــدە دەزانم، نورێکی نــوێ لە بری چــرا کزەکەم، دیوەخانــی دڵم ڕووناك دەکاتەوە!

هیلال

گەڵاڕێزان گوڵی باخانی دابا!
بەهارێ دیکە دێ ئەم داخە لابا!
هەناسەی باخەوانی پیرەدەیگوت:
هەزاران خۆزگە ژینی من وەهابا!

شەریف

# ئەدەبی کوردی ٢

## لەخزمەتی (نالی)دا

هەر کەسێ ڕووی تۆ دەبینێ، خۆی بە قوربانی دەکا
چونکە ئەبرۆی تۆ هیلالی عیدە، قوربانی دەوێ

بەوەشەوە ناوەستێ نالی شاعیر، بەڵکو دەڵێت:

ئاسمانی حوسنی (مەحبوبە)م، لە ئەبرۆو زوڵفو ڕوو
دوو هیلالو دوو شەوو دوو ماهی تابانی هەیە!

هەروەکو بەڵێنماندابوو، بە مەبەستی ئاشنابوون بە ئەدەبی بەرزی کوردی، دەچینە کۆڕی گەرمی شاعیرانی کوردو سەرەتا لە باخچەی پڕ گوڵو گوڵزارو گوڵستانی شیعری (نالی)یەوە، دەست پێدەکەینو دەچینە خزمەتی وشەی جوانو وەسفی ناسكو تەعبیری وردی ئەو شاعیرە بەرزە، هەرچەندە زۆر زەحمەتە هەڵگرتنی خامە بۆ باسکردنو وەسفکردنو ناساندنی (نالی)، بەڵکو مرۆڤ بە شەرمەوە بە تەواوی ترسو لەرزێکی زۆرەوە دەتوانێت خۆی لە قەرەی وەها کارێك بدات، ئەگەر شیعرناسێکی بە تواناو مەلەوانێکی زیرەکی دەریای شیعریش بێت، چ جای نووسەری ئەم چەند دێڕە کە تەنها عاشقێکی شیعری نالیو زەوواقێکی ئەدەبی بەرزو وتەی جوانو شیعری ناسکە.

بەندە چی بڵێت، کاتێك نالی خۆی لە وەسفی شیعرەکانی خۆیدا دەڵێت:

شیعری خەڵکی کەی دەگاتە شیعری من، بۆ ناسکی؟
کەی لە دیققەتدا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکات؟

وەلێ بە هیوای بەهرەمەندبوون، لە گەنجینەی پڕگەوهەری (نالی)، بەشێك لە شیعرەکانی دەخوێنینەوەو چەند ساتێك لەگەڵ عیشقی نالیو نازی (حەبیبە)و سۆزی بێ سنوردا، لە بەهەشتی شیعری نالیدا، کاتێکی خۆش بەسەردەبەین.

مەلا خدری میکایلی کە (نالی) بە نازناوی شیعری هەڵبژاردووە، بەشێکی زۆری شیعرەکانی بۆ غەزەل تەرخان کردووە بە هەوێنی شیعرەکانی کە دەکرێت، تەنها ڕەمزێك بێت، بۆ شیعری غەزەلو دڵداری نالی، یاخود بە حەقیقەت لە (ماڵیاوا) کەسێکی بەو ناوەی بە حەبیبەو مەحبوبەی خۆی زانیبێت.

نالی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرو بە گوزارشێکی بێ وێنە، بە وەفایەکی عاشقانە، داستانی عەشقێکی نەمرو سۆزێکی بێ سنوری تۆمارکردووەو وێنەیەکی وەهای بۆ (مەحبوبە) کێشاوە، کە خوێنەری شیعرەکانی (نالی)، دەبێت بەرامبەریان سەرسام بووەستێو دەستی سەرسامی بخاتە ژێر چەناگەی سەرسوڕمانو لە عالەمی وەسفی جوانو تەعبیری ناوازەی نالیدا غەرقی خەیاڵاتی بەرزو وێنەی لە سنور بەدەر جوانی (مەحبوبە) بێت، گرنگیش نییە مەحبوبە ناوی ڕاستەقینەی یاری (نالی) بێت، یاخود ناوێك بێت کە نالی خۆی لە مەحبوبەی خۆی نابێت، کە هەر خۆی دەیزانێو دەیناسێ!

جەنانی وەك جینان کردم بە ماوا
حەبیبەی (ماڵیاوا) ماڵی ئاوا

واتە: حەبیبەی من کە خەڵکی گوندی (ماڵیاوا)یە، ماڵی ئاوابێت کە دڵی (جەنان) وەك باخچەو بەهەشت کردم بە مەنزڵی خۆی، واتە دڵی داگیر کردمو تەنها کردی بە جێگای خۆی!

ئەگەر تەماشای چەند دێڕێکی نالی بکەین، دەزانین (مەحبوبە) چەندە لە دڵی نالیدا شیرین بووەو بە چ زمانێکیش گوزارش لەو هەستەی خۆی دەکات!

مامۆستا مەلا کەریمی مودەریس دەڵێت: نالی لەم بەیتەدا ڕووی جوانی یاری شوبهاندووە، بە ئاسمانو برۆکانی کردووە بە دوو مانگی یەك شەوە، زووڵفە ڕەشەکانی بە دوو شەوی تاریكو ڕوومەتەکانی بە دوو مانگی تابان، ئەم هەموو شتە ناکۆکەی بە جارێ لە ڕوویدا کۆکردووەتەوە، کە نە دوو دووی تیا کۆدەبێتەوە، نە مانگی یەك شەوەو نە مانگی تابان، بە جارێو نە شەوی تاریكو مانگی تابان پێکەوە.

یاخود چەند جوانو وەستایانە، یاری بە وشەکان دەکاتو ڕەوانبێژییەکی بەرز دەنوێنێو جیناسێکی عەجیب بەکاردەهێنێت.

نالی لەبی (حەبیبە) هەم طیب و
هەم طەبیبە

خولاصەیی لەبیبە، فەرمانبەری لەبی بە!

طیب، واتە: گولاو، طبیب، پزیشك، لەبیب، واتە عاقڵو ژیر، بەڵام (لەبی بە)ی دووەم، مانایەکی جیاوازی هەیە، (لەب) واتە لێو، (بە) فەرمانەو پاشگرە، واتە ملکەچی فەرمانی لێوی ئەوبە!

خۆشویستی نالی بۆ (مەحبوبە) دەگاتە ڕادەیەك کە دەڵێت:

شەقی کە،غەیری حوببی تۆی تێدا بێ
بە دەستی خۆت دڵم دەربێنە قوربان!

تا کۆڕێکی تر لە دیوەخانی شیعری نالی بە خوداتان دەسپێرم!

شێخانی


قەڵەوی و ڕێژیم
جۆرەکانی، هۆیەکانی، زیانەکانی، خۆپاراستن، چارەسەری
دانانی
دکتور إبراهیم طاهر معروف قورشاغلویی
پسپۆر لە تەندروستی کۆمەڵ
دکتۆرا لە دراساتی ئیسلامی


وەرزش و تەندروستی
کوڕان و کچان و بەساڵاچوان
دانانی


جگەرەکێشان
جۆرەکانی، زیانەکانی، چۆنیەتی وازهێنانی
دانانی
دکتور إبراهیم طاهر معروف قورشاغلویی
پسپۆر لە تەندروستی کۆمەڵ
دکتۆرا لە دراساتی ئیسلامی